


حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی






بەڕێوەبەرێتیی

چاپ و بڵاوکردنەوەی

سلێمانی

٢٠١١

# دنیای سوهراب

## هەوڵدان بۆ خوێندنەوەی تایبەتمەندییەکانی دنیای سوهراب


**محەمەد کوردۆ**



سلێمانی
٢٠١١


## دنیای سوهراب


- ❖ نووسەر: محەمەد کوردۆ
- ❖ بابەت: لێکۆڵینەوە
- ❖ پیتچنی و هەڵەچنی: نووسەر
- ❖ نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: ئەکرەم محەمەد ئەمین
- ❖ سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلاّ
- ❖ قەبارەی کتێب: ١/٢ A٤
- ❖ ژمارەی لاپەڕە: ١٦٥
- ❖ زنجیرەی گشتیی کتێب: ( ٨٢٩ )
- ❖ تیراژ : (٧٥٠) دانە
- ❖ چاپ: چاپخانەی لەریا
- ❖ نرخ: (١٥٠٠) دینار
- ❖ ژمارەی سپاردنی (٢٢٦٠ )ی ساڵی ٢٠١١ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**
**گردی ئەندازیاران/ بەرامبەر رۆژنامەی کوردستانی نوێ**
**ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩**

**پێشکەشە بە تۆ کە دنیای سوهرابت خۆش دەوێت**



سوهراب پاش تەواوکردنی قۆناغی ناوەندیی، بۆ ئەوەی لە فەزایەکی بەرینترو گونجاوتردا زانست و هونەر بدۆزێتەوە، لە کاشانەوە بەرەو تاران دەڕوات.

جارێکیان لە پشووی هاویندا دەگەڕێتەوە کاشان، (پەری دوختی) خوشکی داوای ناونیشانی لێ دەکات، بۆ ئەوەی نامەی بۆ بنێرێت، لە وەڵامدا دەڵێت: ((لەسەر زەرفەکە بنووسە دونیای سوهرابی سپەهری، دەگاتە دەستم))(١)

# پێشەکی

رەنگە یەکەمین پرسیارێک کە مرۆڤ دوای بینینی ناونیشانی ئەم هەوڵە بە مێشکییدا تێ بپەڕێت پرسیارێکی لەمجۆرە بێت: دنیای سوهراب یانی چی و بۆچی دنیای سوهراب؟

ڕاستە لە هەموو سەردەمێکدا کەم و زۆر شاعیری باش هەبوون و هەن، بەڵام هەمیشە ئەو شاعیرانەی توانیویانە خاوەنی دنیای تایبەت بە خۆیان بن، زۆر دەگمەنن.

بێگومان سوهراب یەکێک لەو شاعیرە دەگمەنانەیە کە خاوەنی دنیای تایبەت بە خۆیانن، لە دنیاکەی سوهرابدا زۆر شت دەگوزەرێ کە نە لە دنیای واقیع و نە لە دنیای شاعیرانی دیکەدا بوونیان نییە، یان ئەگەر هەشبن جۆرێکی دیکەن. ئەم کارەی من هەوڵێکە بۆ خوێندنەوەی ئەو دنیایە و دەستنیشانکردنی بڕێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەو دنیایەیەش لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم کارەیە.





وەکو چەند کارێکی دیکەش کە لەمەوبەر ئەنجامم داون و بڵاوم کردوونەتەوە، کارم بەو ئاڕاستە رەخنەییە کردووە کە پێی وایە: ((کاری گرنگی ڕەخنە چییدی ئاشکراکردنی مانای دەق و ئەوە نییە کە خاوەن دەق دەیەوێت بیڵێت، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە دەق ژمارەیەکی بێکوتا مانای هەبێت. هەروەک کاری سەرەکی ڕەخنە هەڵوەشاندنەوە و ڕاڤەکردنی دەقیش نییە، بەڵکو بەرهەمهێنانی دەقێکی دیکەیە لەڕێی ئەو دەقەوە کە لێی دەکۆڵێتەوە))(٢)

لێرەوەیە هەوڵم داوە بەرهەمێک پێشکەش بکەم کە وێڕای هەر وردبوونەوە و دۆزینەوە و خوێندنەوەیەک بۆ دەق و تایبەتمەندییەکانی دەقی سوهراب، رەگەزی چێژیش تیایدا رەگەزێکی زاڵ بێت، واتە خوێنەر بتوانێت وەکچۆن چێژ لە شیعرەکان وەردەگرێت، چێژ لەم هەوڵەی منیش وەربگرێت، بۆ ئەمەش سەرەتا بە پرسیاری سوهراب کێیە؟ دەستم پێ کردووە، کە تیایدا بڕێک گۆشەی ژیانی سوهرابم ڕوون کردۆتەوە. لەم بەشەدا کاری من گێڕانەوەی ژیانی سوهرابە، ڕەنگە ئەم بەشە جگە لەوەی چێژێکی زیاتر بە کارەکە ببەخشێت و یارمەتیدەرێک بێت بۆ خوێنەر باشتر لە بەشەکانی دیکەی کارەکە وردبێتەوە، گرنگییەکی ئەوتۆی نەبێت.

ئەم بەشە، لە ڕاستییدا، خستنەڕووی کتێبێکە بە ناوی (سوهراب باڵندەی کۆچەر)، کە (پەری دوختی سپەهری) خوشکی سوهراب، نووسیویەتی و (نەوزاد محەمەد)



کردوویەتی بە کوردی. (حسین سۆران) پێشەکی بۆ نوسیوە و ئەرکی لە چاپدانیشی لە ئەستۆ گرتووە. ئەم خوێندنەوەیە کاتی خۆی لەلایەن منەوە بۆ ئەو کتێبە کراوە و بڵاوکراوەتەوە.(٣)

لەبەشی دووەمدا وەڵامی پرسیاری (بۆچی سوهراب؟)م داوەتەوە و لە بەشەکانی دیکەشدا هەوڵم داوە بڕێک لە تایبەتمەندییەکانی دنیای سوهراب دەستنیشان بکەم و خوێندنەوەی تایبەتی خۆمیان لە بارەوە بخەمە ڕوو، کە هەرگیز مەرج نییە تۆی خوێنەر بە هەمانشێوەی من ئەو تایبەتمەندییانە ببینیت، بگرە مەرجە بە هەمانشێوەی من نەیبینیت، چونکە دواجار ئەم سەرنج و تێگەیشتن و خوێندنەوانە، سەرنج و تێگەیشتن و خوێندنەوەی منن.

لە کۆتاییشدا ئەنجامەکانی ئەم هەوڵەم لە چەند خاڵێکدا کورت و چڕ کردۆتەوە.

تەواوی کۆپلە و وێنە و دەستەواژە شیعرییەکانی سوهرابیشم لە دیوانی (عاشق هەمیشە تەنیایە) وە وەرگرتووە، کە (ئازاد بەرزنجی) وەریگێڕاوە و دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە ساڵی ٢٠٠٦ دا، بە چاپی گەیاندووە.

هیوادارم بتوانم ئەوەی بیری لێدەمەکەوە بە ئێوەی بگەیەنم.



## سوهراب کێیه؟

سوهراب شاعیر و نیگارکێشی مەزنی ئێران، لە ١٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٨دا، لای نیوەڕۆ لە کاشان هاتۆتە دنیاوە.

کوڕی خێزانێك بووە کە یەکێك لە نەریتەکانی ئەو خێزانە کتێب خوێندنەوە بووە.

سەرەڕای ئەوەی مەنوچەهری برا گەورەی کتێبخانەیەکی ٩ هەزار کتێبیی هەبووە کە زۆربەیان لەسەر ڕا و پێشنیازی سوهراب کڕراون، ڕۆمانی قەبارە ئەستوور و چەند بەرگییان لە کتێبفرۆشێك بەکرێ وەرگرتووە و دوای نانی شێوان کتێب خوێندنەوەی بە کۆمەڵ دەستی پێ کردووە. سەرەتا دایکیان، کە وەك پەری دوختی خوشکی سوهراب دەڵێت: ((لە وانەیە تەنها کارمەندی ژن بوو بێت لەو سەردەمەی دەوڵەت لە شارەکەماندا))،





بەدەنگی بەرز کتێبی بۆ خوێندوونەتەوە، پاشان سوهراب و منداڵەکانی دی بەنۆرە و بەدەنگی بەرز دەستیان بە خوێندنەوە کردووە و ئەوانی دی گوێیان گرتووە.

سوهراب هەر لە منداڵییەوە خەون و خەیاڵی سەیری هەبووە، بۆ نمونە: زۆر جاران لە خەوندا فڕیووە، تەنانەت بۆ پیادەکردنی خەونەکانی جارێکیان لەگەڵ منداڵگەلێکی دیکەدا بڕیاریان داوە بە پەڕەشووت خۆیان هەڵداوێن. بۆ ئەم مەبەستە چادرێکیان هێناوە و ستوونێکیان خستۆتە نێوەندی و لە هەرچوار لاوە تیرەداریان پێوە لکاندووە.

زۆرجاریش لاقی دارینەی بۆ خۆی دروست کردووە کە بەوە توانیویەتی هەنگاوی درێژتر بهاوێت و لە بەرزی یەك مەترەوە، شتەکان ببینێت.

هەر بەمنداڵییش لە جیاتی بولبول و کەناری کوندەپەپوویەکی لە قەفەس کردووە.

سوهراب لە دوایین ساڵی زانکۆدا کە یەکەمین کتێبی خۆی بەناوی (ڕەنگی مەرگ) چاپ کردووە، چۆتە سەر هەرکارێك پاش ماوەیەکی کورت وەلای ناوە و ئاوهای پاکانە بۆ کردووە: ((کاری سەرەکیی من دانانی شیعر و تابلۆکێشانە و ناتوانم چیدیان رەگەڵ بخەم)).



ئەم شاعیر و نیگارکێشە مەزنە، ئەگەرچی بەهۆی ئەوەوە کە راوکردن ئارەزوویەکی دیکەی بنەماڵەکەیان بووە، لە منداڵییدا بەتیر و کەوان و تەپکە چۆلەکە و کووڕەی گرتووە و سەردەمانێکیش بەگەورەیی هەموو رۆژی هەینییەک لەگەڵ مامەکانییدا چۆتە ڕاوی کۆتر و قومری، بەڵام دواتر زۆر جاران دۆست و ئاشنایانی ئەویان لە کەناری جۆگەیەک یان حەوزێکی ئاو بینیوە، یان بە چیلکە دارێک یان گەڵایەکی بەدەستەوە گرتووە و خەریکی ڕزگارکردنی مێروو، یاخود پەپوولە بووە.

تەنانەت ساڵێکیان کە پشووی هاوینە بووە، کوللە هێرشی بۆ دەشتەکانی دەوروبەری کاشان بردووە. بۆ ئەم مەبەستە سوهراب بەنێوی سەرپەرشتیاری دەستەی قەڵاچۆکردنی کوللەوە بۆ ئەو دەشتانە دەنێرن، کە دەگەڕێتەوە لێی دەپرسن:

–چۆن لەگەڵ کوللەکاندا دەجەنگایت؟

دەڵێت: ((ڕێی ڕۆشتنم زۆر بەزەحمەت بوو، چونکە جگە لە کوللە چیدی بەسەر زەوییەوە دیار نەبوو، منیش دەمویست جۆرێ رێبکەم کوللە لە ژێر پێمدا نەپلیشێتەوە)).

** *

سوهراب جگە لەوەی بەمنداڵیی (وەک خۆی دەڵێت): لە قوتابخانە سەری هەڵ نەبڕیووە، لە ماڵەوە بزۆز بووە، لە قوتابخانە ترساوە، لەماڵەوە ئەم ئەوانی ترساندووە.





بەگەورەییش کەسێکی شەرمن بووە و هەمیشە بانگهێشتی رۆژنامە و گۆڤارەکانی بۆ چاوپێکەوتن ڕەتکردۆتەوە. ڕۆژی کردنەوەی پێشانگاکانی ئامادە نەبووە، وتویەتی: ((ئەوانە دێنە بینینی کارەکانم بەمن کارێکیان نییە)).

زۆر جاران داخوازیی ئەوەی لێ کراوە ڕەزامەندی پێشان بدا فیلمێک لەسەر ژیانی بەرهەم بهێنن، ڕازی نەبووە. تەنانەت هەندێجار (سێکچ)ەکانیان بردووە و نەیانهێناوەتەوە، لەشەرمان داوای گەڕانەوەی نەکردووە.

***

سوهراب شارەزاییەکی باشی لەزمانی فەرەنسی و ئینگلیزییدا هەبووە و بڕێک شیعری ژاپۆنی لە ئینگلیزییەوە بۆ فارسی وەرگێڕاوە.

شیعرەکانی جگە لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و عەرەبی، بۆ تورکی و ئیسپانی و سویدییش وەگێڕدراون.

ئەم شاعیر و نیگارکێشە مەزنەی ئێران بەدوای شوێنەواری هونەرە بەرجەستەکان و کەلتور و فەلسەفەی وڵاتانی دیکەدا گەشتی بۆ زۆر شوێنی ئەم جیهانە کردووە، لەوانە: پاریس، لەندەن، نیویۆرک، ڕۆما، ژاپۆن... هتد.

* * *



**بە لای سوهرابەوە قورئان جگە لەلایەنی خودایی و پیرۆزییەکەی، یەکێك لە بەنرخترین شاکارەکانی ئەدەبی جیهانیی بووە.**

**مەولەوی بەگەورەترین شاعیر و عارفی مێژووی ڕۆژهەڵات زانیوە و کوشتەی شیعرە پڕ خرۆشەکانی دیوانی (شمس) بووە.**

**هەروەها بە چاوی پڕ بایەخ و سەرسوڕمانەوە بۆ غەزەلیاتەکانی حافزی شیرازی ڕوانیوە. لە یەکێك لە دوایین ڕۆژەکانی عومریدا کە لە نێو نوێنی نەخۆشییدا بووە، کاتێك دەربارەی مەنسووری حەلاج دواوە، پەری دوختی ڕاسپاردووە کە هەر دەبێت کتێبی (تذکرة الاولیاء)ی شێخی عەتار بخوێنێتەوە، کە باس لە حاڵ و کەراماتی عیرفانییە ناودارەکان دەکات.**

* * *

***لە قەسیدەی (دەنگی پێی ئاو)دا، ئەم نیوە بەیتە:**

(کوشتنی شاعیرێکی خەمگین بەدەستی گوڵی سۆڵ)

**سەرەتا بەمجۆرە بووە:**

(کوشتنی شاعیرێکی خەمگین بەدەستی گوڵی سوور)، **کاتێك (هەشت کتێب) کەوتۆتە ژێر چاپەوە، پێویست بووە هەموو کتێبێك بە تەواوی پاکسازییەوە بە ژێر سانسۆردا تێ بپەڕێت، سوهراب گوتوویەتی:**





((ئەگەر زۆر گۆڕانکارییم پێبکەن ئەوا لە چاپکردنی چاوپۆشی دەکەم)).

**سەرەنجام پێی ڕاگەیاندراوە لەبری وشەی (گوڵی سوور- گل سرخ) کەڵك لە گوڵی سۆڵ، یان گوڵی سەهۆڵ- گل یخ) وەربگرێت.**

**چونکە لەو سەردەمەدا (خەسرەو گوڵ سورخی) شاعیری کۆمەنیستی دژ بەشا لەزینداندا بووە و لەوە ترساون ئەو وشەیە لە فیکر و خەیاڵی خەڵکییدا جێگیر ببێت.**

**سوهراب گۆڕانکارییەکەی قبوڵ کردووە، چونکە کاریگەرییەکی ئەوتۆی بۆ سەر شیعرەکە نەبووە، بەڵام گاڵتەی بەکەم ئەقڵیی بەرپرسەکان کردووە و وتوویەتی:**

**((شیعر لە پشتی دەریاکانەوە گومانی زێتر دروست دەکات)).**

***

***سوهراب دەربارەی نیوە بەیتی:** (تابتەوێ خۆر، تابتەوێ پەیوند، تابتەوێ، لەبەرگرتنەوە) **وتوویەتی: وشەی لەبەرگرتنەوە پێشنیازی فەروغی فرخزاد بوو، هەرچەندە بەدڵم نەبوو، بەڵام بەخاتری ئەو وەك خۆی هێشتمەوە.**

* * *

**سوهراب دوای ئەوەی دووچاری (شێرپەنجەی خوێن) دەبێت، بۆ چارەسەر لەگەڵ پەری دوختی خوشکییدا دەچێتە لەندەنیش،**



**بەڵام سوودی نابێت. پاش گەڕانەوەی بۆ ئێران بەماوەیەکی کورت، دووبارە دەگوێزرێتەوە نەخۆشخانە و ئیدی ناگەڕێتەوە ماڵەوە، لەو ماوەیەی کە لە نەخۆشخانەدا دەبێت، کیژۆڵەیەکی نازدار هەموو ڕۆژێك بەچەپکە گوڵێکی سوورەوە دەچێتە سەردانی، بەڵام بەهۆی نالەباری حاڵی سوهرابەوە، بێئەوەی بیبینێت نەخۆشخانەکە جێ دەهێڵێت..**

**ڕۆژێکیان لەگەڵ دواساتەکانی سوهرابدا دیارنابێت، کەسوکاری سوهراب زۆر بۆی نیگەران دەبن، پاشان ڕۆژی دوایی دەچێت و دەڵێت:**

**((دوێکە لە بۆ گوڵاڵە سورە چوومە پێدەشتەکانی لای کەرەج، بەداخەوە مانشێنەکەم لێ خەرابوو، ئیدی بۆم نەکرا بێم، بمبەخشن)).**

**سەعات شەشی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی یەکەمی مانگی (گوڵان)ی ساڵی ١٩٨٠ ڕۆحی سوهراب لەزیندانی سینەی ڕزگاری دەبێت و لە زیارەتگای مەشهەدی ئەردەهاڵ بەخاك دەسپێرێت.**

**لە ڕێوڕەسمی حەوتەمین شەوی مردنی ئەو خۆشەویستەدا، کەسوکار و کۆمەڵێك لە دۆستان لەسەر گۆڕەکەی کۆدەبنەوە.**

**سەرتاپای گۆڕەکەی بەخونچەی گوڵەباخی گەش دادەپۆشرێت و دۆستەکانیشی بە گوڵاڵە سوورە گۆڕەکەی گوڵباران دەکەن.**





**پاشان (رضماني) کێلی گۆڕەکەی ئامادە دەکات و بە خەتێکی جوان ئەم شیعرەی سوهراب خۆی بەسەرەوە دەنووسێت:**

((ئەگەر بەشوێن مندا دێن
هێدیو لەسەرخۆ وەرن،
نەوەک درزبدا
چینی ناسکی تەنیایی من)).



# بۆچی سوهراب؟

بە بڕوای من شیعری راستەقینە، وێڕای هەر ناسنامەیەکی دی، کە مرۆڤ بیەوێت پێی ببەخشێت، خاوەنی ناسنامەیەکی گەردوونییشە، گەردوونیی بەو مانایەی خاوەنی زمانێکە دەتوانێت خەم و خەون و خۆزگەی مرۆڤەکان بەبێ هیچ جیاوازییەك لە خۆیدا هەڵبگرێت و بە ناو سەردەمە جیاجیاکاندا تێبپەڕێت و مرۆڤگەلی زۆرترین نیشتمان و نەتەوە و بیروباوەڕی جیاجیا لە خۆی کۆبکاتەوە و بە دوورترین شوێنی دنیا بگات. شیعری راستەقینە خاوەنی زمانێکە دەتوانێت لە پشتی هەموو ئەو چەمکانەوە، لە شوێنێکی بالاتردا بدرەوشێتەوە و دڵەکان بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت.





ئەو شیعرەی ئێمە مەبەستمانە، یەکێك لەو بەرهەمە گەردوونیانەی مرۆڤە کە دەتوانێت ئینتمای مرۆڤەکان لە ئینتیماگەلی سنوورداری وەك ناوچە و نیشتمان و نەتەوە و بیروباوەڕی دیاریکراوەوە بۆ ئینتیمای گەردوونیی بەرز بکاتەوە، دەتوانێت لەڕێی ئەو خەم و خەون و خۆزگە گەردوونیانەوە کە لە خۆیدا هەڵی گرتوون، هەموومان پێکەوە لە ئامێز بگرێت.

بێگومان ئەم وتانە هەرگیز بە مەبەستی کەمکردنەوە لە نرخی هیچ کام لەو چەمکانە نین کە باسمان کردن، بەڵکو بە مەبەستی دۆزینەوەی چەمکێکی گەورەترن، کە دەتوانێت هەموومان پێکەوە کۆبکاتەوە. شیعر کاتێ بەناو سەردەم و نیشتمان و نەتەوە و بیروباوەڕە جیاوازەکاندا دەمانبات، خۆشەویستییمان بۆ ئەوان کاڵ ناکاتەوە، بەڵکو خۆشەویستییەکی گەورەتر و گشتگیرترمان پێ دەبەخشێت.

وەکچۆن مرۆڤ کاتێ گوند، یان شارەکەی خۆی خۆش دەوێت مانای ئەوە نییە ماڵەکەی خۆی خۆش ناوێت، یاخود کاتێ نیشتمانەکەی خۆی خۆش دەوێت مانای ئەوە نییە گوند، یان شارەکەی خۆی خۆش ناوێت، هەر ئاوها کاتێکیش روحێکی گەردوونیی لە خۆیدا درووست دەکات، مانای ئەوە نییە روحی خۆشویستنی نیشتمان و نەتەوە و بیروباوەڕێکی دیاریکراو لە



خۆیدا دەکوژێت، بەڵکو مانای ئەوەیە سنووری خۆشەویستی ئەو فراوانتر دەبێت.

ئەو کاتە، وەکچۆن خەڵکانی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی خۆش دەوێت، هەر ئاوها خەڵکانی نەتەوە و نیشتمانەکانی دیکەی دنیاشی خۆش دەوێت. وەکچۆن ئەو خەڵکانەی خۆش دەوێت لەگەڵیدا هاوبیر و باوەڕن، هەر ئاوها ئەو خەڵکانەشی خۆش دەوێت کە لەگەڵیدا هاوبیر و باوەڕ نین.

چەند خۆشە کە ئێمە دەتوانین وەکچۆن، بۆ نمونە، نالی و مەحوی، بە موڵکی خۆمان دەزانین، هەر ئاوها موتەنەبی و حافز و هەر شاعیرێکی دیکەی دنیاش بە موڵکی خۆمان بزانین!

چەند جوان بوو بەلامەوە کاتێ بینیم برادەرێکم، کە بۆ پیرۆزبایی خانووەکەم هاتبوو، وێنەیەکی سوهراب-ی بە دیاری بۆ هێنابووم!

بۆ من، خوێندنەوەی هێنانی ئەو وێنەیە، بەمجۆرە بوو: ئەو هاورێیەم وێڕای خۆشەویستی خۆی بۆ سوهراب و دڵنیابوونی لە خۆشەویستی منیش بۆ سوهراب، دەیویست پێم بڵێت: ماڵی راستەقینەی ئێمە شیعرە، شیعری ئێمەش تەنها ئەو شیعرانە نین کە لەلایەن هاو سەردەم و هاو زمان و هاو نیشتمان و هاوبیروباوەڕانی خۆمانەوە نوسراون.





ئێستا منیش کە هاتووم لەناو دەیان و سەدان شاعیری خۆماندا قسە لەسەر سوهراب دەکەم، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، یان رەنگە راستەوخۆش، بمەوێ ئەو راستییە بۆ خۆم و بۆ ئێوە دووپات بکەمەوە کە شیعری راستەقینە بەرهەمێکی گەردوونییە و مرۆڤەکان لە هەر شوێنێکی دنیا بن، خاوەنی هەر خاك و زمان و بیرو باوەڕێك بن، دەتوانن وەکو یەك خۆیان بە خاوەنی شیعرە راستەقینەکان بزانن.

سوهراب جگە لەوەی لەڕێی شیعرەکانییەوە بە کردەوە لە وڵاتێك پەڕیووەتەوە کە پێی دەڵێن ئێران و لە نەتەوەیەك دوورتر ڕۆیشتووە، کە پێی دەڵێن فارس، لە خودی خۆیشیدا بڕوای وابووە کە ئەو بە تەنها خەڵکی کاشان نییە:

من خەڵکی کاشانم، وەلێ
شاری من کاشان نییە
شاری من ون بووە

دەشێت شاری ئەو کەرکوك، یان نیویۆرك، یان لەندەن، یان پاریس، یاخود هەر شارێکی دیکەی دنیا بێت، وەك دەشگونجێت شاری ئەو هەموو شارەکانی دنیا بێت. ئەو بە تەنها گوێگری (با)کانی ئێران نەبووە، گوێگری (با)کانی جیهان بووە:

من تاقە گوێگری باکانی جیهانم.



**تەنانەت سوهراب هەر بەوەوە نەوەستاوە تەنها کاشان بە شاری خۆی نەزانێت و ڕەچەڵەکی خۆی بۆ شوێنێکی دوورتر ببات، بەڵکو لە مرۆڤەکانیش پەڕیوەتەوە و بۆ دوورتر ڕۆیشتووە:**

ئەشێ ڕەچەڵکم بچێتەوە
سەر ژنێکی سۆزانیی شاری بوخارا.
ئەشێ ڕەچەڵکم بچێتەوە
سەر گیایەک لە هند.

**سوهراب پێی وابووە لەهەر کوێ بێت ئاسمان هی خۆیەتی:**

لە هەر کوێیەک بم
ئاسمان هی منە.
پەنجەرە، بیر، هەوا، عیشق، زەوی هی منە.
چ بایەخێکی هەیە گەر هەندێجار
قارچکەکانی غوربەت بڕوێن؟

**لێرەوە لە گەردوونێتیی سوهراب تێدەگەین و بایەخی ئەویش بۆ ئێمە، تەنها لەوەدا نییە کە شاعیرێکی گەردوونییە: بەڵکو لەوەش دایە کە ئەو شاعیرێکە کاریگەری ئاشکرای لە ناو شیعری ئێمەدا هەیە.**





**ڕەنگە ئاسان نەبێت، بە تایبەت لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو بە دواوە، شاعیرێکی دیکەی غەیرە کورد بدۆزینەوە بەقەد سوهراب کاریگەری لەسەر شیعری ئێمە، هەبووبێت.**

**لێرەوەیە کە من بە پێویستی دەزانم قسە لە سەر دنیای سوهراب بکەم.**



# سوهراب و واقیع

بەبڕوای من شیعری سوهراب شیعرێکی دابڕاو نییە لە واقیع و لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ، وەك هەندێك وای بۆدەچن، بەڵكو شیعرێکە بە کەرەستە تایبەتییەکانی خۆی لەناو ئەو واقیعەدا و بە ئاراستەی گۆڕینی ئەو واقیعە کار دەکات.

لای سوهراب گۆڕینی واقیع لەبری ئەوەی لە ڕێگای تیژکردنی مرۆڤەکانەوە ڕوو بدات، لە ڕێگای سادەکردنەوەی مرۆڤەکانەوە ڕوو دەدات. سوهراب لەبری ئەوەی بۆ گۆڕینی ئەو واقیعەی مرۆڤەکان دەهاڕێت، هانیان بدات (ئەسبابی شەڕ) پەیدا بکەن، هانیان دەدات ئەسبابی جوانییان هەبێت. فێریان دەکات لەبری (تۆپ و تفەنگ و هاوان)، گوڵ و باخچە و حەوزیان هەبێت.





سوهراب کە لە زۆر جێگادا کەوتۆتە ژێر کاریگەریی گاندی و فەلسەفەی بودیزم و هیندویزم، بە هەمان شێوەی گاندی پێی وابووە: پێویستە مرۆڤ بەرلەوەی ڕقی لە تاوانبار بێت، ڕقی لە تاوان خۆی بێت.

لای سوهراب مرۆڤ بۆئەوەی نەتوانێت خوێن بڕێژێت، دەبێت فێربێت ئاو لێڵ نەکات.

بۆئەوەی نەتوانێت مرۆڤ بکوژێت دەبێت فێربێت گیا هەڵ نەکەنێت.

لای سوهراب لە حزووری گوڵە شەمدانییەکاندا توندوتیژیی دەتوێتەوە.

بێگومان هەمیشە بۆ مرۆڤ دوو دنیا هەیە، دنیایەکی گەورە، کە مرۆڤەکان لەناویدا دەژین و دنیایەکی بچوك، کە لە ناو مرۆڤەکاندا دەژی. ڕەنگە یەکێك لە جیاوازییە گەورەکانی سوهراب لەگەڵ زۆرێك لە شاعیرانی دیکەدا لەوێوە سەرچاوەی گرتبێت کە ئەم پێی وایە دەبێت سەرەتا دنیا بچوکەکەی ناو خودی مرۆڤ- کە دنیای جەوهەریی و راستەقینەیەتی- جوان بکرێت، ئینجا جوانکردنی دنیا گەورەکە- کە دنیای ڕۆتین و ژاوەژاوی ڕۆژانەیە- گونجاو دەبێت. واتە لای سوهراب گۆڕینی دنیا ئەگەر بەنێو گۆڕینی جیهانبینی و تێگەیشتنی مرۆڤەکاندا تێنەپەڕێت، بێکەڵکە.



مێژووی مرۆڤایەتیش لە زۆرێك لە وێستگەكانی خۆیدا راستی و دروستی ئەم بڕوایەمان بۆ دووپات دەكاتەوە. لەدنیادا دەیان و سەدان شۆڕش و راپەڕین و كودەتا روویان داوە و دواجار نەیان توانییوە بارودۆخی مرۆڤەكان بگۆڕن. بۆچی نەیان توانییوە؟

چونكە زۆرینەی شۆڕش و راپەڕین و كودەتاكان تەواوی سەرنجی خۆیان لەسەر دنیای دەرەوەی مرۆڤەكان چڕكردۆتەوە و دنیای ناوەوەی مرۆڤەكانیان فەرامۆش كردووە. زۆربەی جارەكان پاشا، یان هەر دەسەڵاتدارێكیان لابردووە و یەكێكی دیكەیان خستۆتە جێگاكەی كە تێگەیشتنی بۆ دنیا و بۆ مرۆڤ و بۆ ژیان، جیاوازییەكی جەوهەریی لەگەڵ ئەوی پێش خۆیدا نەبووە. هەر بۆیە لەزۆربەی حاڵەتەكاندا، وەك ئەدۆنیس ئاماژەی بۆ كردووە: ((بارودۆخەكان وەكو خۆیان ماونەتەوە، چونكە ئەوەی چاوی لەسەر بووە و كراوە بە ئامانج، شوێنی كەسەكان بووە، نەك بارودۆخەكان))[٤]

بەڵام لە جیهانبینیی سوهرابدا، كە جیهانبینییەكە، بە مەبەستی گۆڕینی دنیا، بە دوو ئاراستە كار لەسەر سادەكردنەوەی ژیان دەكات، ئەو هاوكێشەیە پێچەوانە كراوەتەوە.

سوهراب لە ئاراستەی یەكەمدا لەشار و لە كەرەستە و ئامێر و ژاوەژاوەكانی شار هەڵدێت و لە ئاراستەی دووەمدا دەچێتەوە نێو سروشت و تێكەڵی هارمۆنیای سروشت دەبێتەوە.





لە رێگای ئەم دوو ئاراستەیەوە- كە پاشان وردتر قسەیان لەسەر دەكەین- مرۆڤ بەرە و سادەیی دەبات و بەو سادەكردنەوەیە ناسكی دەكاتەوە و لەو ڕێگایەوە ژیانی دەگۆڕێت.

بەم شێوەیە سوهراب بۆ ئەوەی ئەو دنیا گەورەیە بگۆڕێت كە مرۆڤەكان لە ناویدا دەژین، لەو دنیا بچوكەوە دەست پێدەكات كە لەناو مرۆڤەكاندا دەژی. ئەو سەرەتا دەستكاری دنیای ناوەوەی مرۆڤەكان دەكات و شتەكانیان تێدا دەگۆڕێت، پاشان دنیای دەرەوەی مرۆڤەكان، خۆی گۆڕانی بەسەردا دێت.

سوهراب لەبری ئەوەی هانی قوربانییەكان بدات لە دژی جەلادەكانیان راپەڕن و بیانكوژن و حیكایەتی كوشتن درێژە پێ بدەن، بیر لەوە دەكاتەوە مرۆڤەكان بەرە و دۆخێك ببرێن كە ئەسڵەن جەلادی تێدا بەرهەم نەیەت. بە دەربڕینێكی دی، شیعری سوهراب لەبری ئەوەی دیوارێك بێت بۆ هەڵواسینی ئەو پۆستەرو دروشمانەی مرۆڤ هان دەدەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی، پەنا بباتە بەر توندوتیژی زیاتر. دیوارێكە لاولاوەكان پیایدا هەڵدەگژێن و كەنارییەكان لەسەری دەنیشنەوە و دنیا پڕ دەكەن لە جریوەی شیرین و لە خۆشەویستی و لە سادەیی و لە ناسكیی. شیعری سوهراب لەبری ئەوەی لافاوێكی توڕە بێت و هەموو شتەكان رابماڵێت، ئاوێكی هێمنە، كە كۆترەكان لێی دەخۆنەوە و رەنگاڵەكان پەڕی پێ دەشۆن و دەروێشەكان نانی پێ تەڕ دەكەن و خەمی دڵەكان دەڕەوێنێتەوە



و جوانی ڕوخساری ژنە شۆخەکان دوو هێندە دەکات. لە شیعری سوهرابدا قەفەسەکان ناشکێنرێن، بەڵام دەرگایان نییە و لەبری باڵندە روناکی لە ناویاندا باڵەفڕە دەکات. لەشیعری ئەم شاعیرەدا مرۆڤ ڕێگەی چوونە رۆخی دەریا و هەڵدانی تۆڕی بۆ ناو ئاوەکان لێ ناگیرێت، بەڵام دەبێت لەبری ماسی تەڕایی ئاو بگرێت. شیعری سوهراب ئیشکردنێکی قووڵە لەسەر بەرهەمهێنانی دنیایەکی دی، دنیایەکی بەدیل، کە تیایدا مرۆڤ بە رادەیەك سادە و ناسك دەبێتەوە مەترسی بۆ سەر هیچ هەبوویەکی سەر ئەم گۆی زەمینە نامێنێت. چەند جوانن ئەو مرۆڤانەی دنیاکەی سوهراب کە نەك ئەسپ و ماینەکان ئازار نادەن، بەڵکو عەلەفی سەوزی دڵنیاییان بۆ رۆدەکەن و سەتڵە شەونمیان دەخەنە بەردەم؟! چەند مەزنن ئەو مرۆڤانە کاتێك دەبینن کچێکی بێ قاچ لەسەر پردێکە، ئەستێرەی دەکەنە مل؟! چەند گەورەن ئەو مرۆڤانە کەبیر لەوە دەکەنەوە کاتێك بەدیداری خودا شادبوون لەبری ئەوەی داوای حۆری و روباری شیر و شەرابی لێ بکەن، پێی دەڵێن حەوزی ماسیەکان بێئاوە؟! چەند میهرەبانن ئەو مرۆڤانە کە بیریان ناچێت پەپولەیەك کەوتبێتە ئاوێکەوە دەریبهێنن؟!

چەند خۆش دەبوو ئێمەش بمان توانیایە وەکو مرۆڤەکانی دنیای سوهراب هەستمان بکردایە خودا زۆر نزیکە لێمانەوە، هەستمان بکردایە خودا لە ناو باخچەکاندایە و دەتوانین لەبری شمشێر لە ڕێی گوڵەکانەوە بیدۆزینەوە؟!





***

پێشتر وتمان لە جیهانبینی سوهرابدا بە دوو ئاراستە کار لەسەر سادەکردنەوە و پاشان ناسککردنەوەی مرۆڤ کراوە. وتمان لەئاراستەی یەکەمدا سوهراب لە شار و لە کەرەستە و ئامێر و ژاوەژاوەکانی شار هەڵدێت و لە ئاراستەی دووەمدا دەچێتەوە نێو سروشت و تێکەڵی هارمۆنیای سروشت دەبێتەوە. ئێستا بابزانین چۆن؟

سوهراب هەستدەکات ئەو ڕوحە سادە و ناسکەی کە دەبێت مرۆڤەکان هەیان بێت، لە شاردا بەهۆی ژاوەژاوی چەرخی زرێپۆش و بەهۆی ڕێی دووری نێوان ئادەمیزادو ئاسن و بەهۆی کۆنکریتی چاخەکان و بەهۆی ئەو خاکە رەشانەوە کە لەوەڕگای سلنگەکانن و بەهۆی پێکدادانی کانزاکان و بەهۆی ژاوەژاوی سەنعاتەوە دەشێوێت.

بۆیە هەوڵدەدات لەشار هەڵبێت و بچێتەوە نێو سروشت، بۆچی دەچێتەوە نێو سروشت؟

چونکە سروشت جگە لەوەی کانگای جوانیی و پاکیی و بەرائەتە، بەخشندەو دڵفراوانیشە، دوژمنایەتی نازانێت و شتەکانی خۆی هەڕاج ناکات:

من نەمدیوە دوو سنەوبەر دوژمنی یەک بن.
نەمدیوە داربییەک سێبەری خۆی بە زەوی بفرۆشێ.
نارەوەن بە خۆڕایی لقی خۆی بە قەلەڕەش ئەبەخشێ.



**تەنانەت لە جیهانبینی سوهرابدا، وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ كرد، خوداش لە نێو سروشتدایە:**

خوایەکیش لەم نزیکانە:
لە نێو ئەم شەوبۆیانە.
کن ئەو کاژە بەرزە.
بەسەر هۆشی ئاوەوە.
بەسەر قانونی گیاوە.

**سوهراب لە ئەزمونی شیعریی خۆیدا بەشێوەیەکی گشتیی تەرکیزی لەسەر سادەکردنەوە و ناسککردنەوەی مرۆڤ و هاوتاکردنەوەیەتی لەگەڵ سروشتدا.**

**ئەو پێی وایە:**

ژیان نەریتێکی خۆشە و

**مرۆڤ ئەگەر بتوانێت وەك سروشت سادەبێتەوەو شتەكان لە خۆی ئاڵۆز نەكات دەتوانێت چێژ لەو نەریتە خۆشەی ژیان وەربگرێت.**

**نزار قەبانی پێی وایە پرۆسەی شیعرنوسین وەكو پرۆسەی سەماكردن وایە، وەكچۆن سەماكەر ئەگەر لەكاتی سەماكردندا بیر لە پێی خۆی بكاتەوەو خەیاڵی لای ئەوە بێت ئەم پێیەی لەكوێ و ئەوی دیكەیان لە كوێ دابنێت، ناتوانێت سەما بكات. شاعیریش ئەگەر لەكاتی شیعرنوسیندا بیر لە وردەكارییەكانی كارەكەی بكاتەوە ناتوانێت شیعر بنوسێت.**[٥]





**لای سوهراب ژیان خۆیشی وەك شیعرنوسین و سەماكردنی لێ دێت. ئەگەر مرۆڤ بەسادەیی بژی و شتەكان لەخۆی ئاڵۆز نەكات، دەتوانێت جوان بژی.**

**سوهراب هەست دەكات ئەگەر مرۆڤ بتوانێت:**

ڕێگە بدات ئیحساس بای باڵی خۆی بدات و
باڵقبوون لەژێر هەر بنچکێکا پێی خۆشبوو دەواری خۆی هەڵبدات و
تەنیایی گۆرانی بچڕێت و
غەریزە یاری خۆی بكات...
ئەگەر مرۆڤ لە فوارەی بەخت نەپرسێت و
لە مەرگیش نەترسێت...

**ئەو كاتە بە دڵنیاییەوە باشتر دەتوانێت چێژ لە نەریتە خۆشەكەی ژیان وەربگرێت. ئاسانتر دەتوانێت لەڕێی گۆڕانی دنیا بچوكەكەی ناوەوەی خۆیەوە، لە گۆڕینی دنیا گەورەكەی دەرەوەی خۆی، نزیك بێتەوە.**



## سوهراب و دنیایەکی دی

ئێمە پێشتر وتمان سوهراب هەوڵیداوە لە رێی شیعرەکانیەوە دنیایەکی دی، دنیایەکی بەدیل، پێشکەش بکاتو بەو جۆرە هەم ناڕازیبوونی خۆی لەو دنیایەی کە هەیە پیشان بدات و هەم رێگایەك بۆ گۆڕینی ئەو دنیایە بخاتە بەردەستی مرۆڤ. ئێستا بابزانین لەو دنیا بەدیلەی سوهرابدا چی دەگوزەرێت؟

لەو دنیایەدا نە ئاین و نە مرۆڤ و نە ئەفسانەکان، لە ئاین و مرۆڤ و ئەفسانەکانی دنیای واقیع ناچن. لە ئاینی ئەو دنیایەدا خودا لە ئەستێرەیەکی دوور نییە، بەڵکو لە نزیکی مرۆڤەکان و لەناو شەوبۆ و کاژە بەرزەکاندایە. قیبلەی ئەوان گوڵەباخ و بەرماڵیان کانی و بەردەمۆریان روناکی و فەرشی نوێژیان دەشتە. ئەوان لەگەڵ ترپەی پەنجەرەکاندا دەستنوێژ دەگرن و دوای ئەوەی کە -با- لەمنارەی دار سەرووەوە بانگ دەدات و





گژوگیا (تەکبیرەتولئەحرام) و شەپۆل (قەد قامەت) دەکات، ئینجا نوێژ دەکەن. کەعبەی ئەوان لە قەراغ ئاو و لەژێر ئەکاکییەکاندایە، کەعبەی ئەوان وەکو نەسیم باخ بە باخ و شار بەشار دەڕوات. (حەجەرو لئەسوەد)ی ئەوان رۆشنایی باخچەیە.

مرۆڤەکانی ئەو دنیایە لە لەرینەوەی گەڵا ناسکترن و لەبری خوێن نور لە دەمارەکانیاندا دەگەڕێت. کاتێ بە نیازی سەردانی یەکترن، لەترسی ئەوەی چینی ناسکیی تەنیاییان درز نەبات، زۆر بە ئەسپایی دەڕۆن. کاروانچییەکانیان باری زەردەخەنە دەهێنن و دەبەن. بەقاڵەکانیان شەونم دەفرۆشن. سوارەکانیان لەبری ئازایەتی خەو بەشۆخ و شەنگییەوە دەبینن و بەربەیانیان لەجیاتی ئەوەی بۆ شەڕ بچن، بۆ سەر تەپۆڵکەی میعراجی گوڵاڵە سوورەکان دەچن. ژنەکانیان لە دەسکەوانا نوور دەکوتن. خەڵکی ئەو دنیایە وێڕای میوە و نان و شەراب، زەمیلەکانیان پڕدەکەن لە خەون. هەوڵ دەدەن بزانن بەختەوەری ئیزرەمی بەچەندە؟ جارەهای جار بە چەندین سەبەتەوە بۆ رنینەوەی بۆڵێك مژدە رێگا دەگرنەبەر. لەسەر سفرەکانیان جگە لەنان و سەوزە، قاپی پڕ لەشەونم و جامی داخی موحیبەت هەیە. ئەگەر کەسێکیان بارانێکی توند لێی بدات، هەوڵدەدات بچێتە پەنا بەردێك و لەبەر ئاگردانی گوڵاڵە سوورە خۆی گەرم بکاتەوە.

لە ئەفسانەکانی ئەواندا هەڵکەندنی گیا دەبێتە هۆی مردنی ئەو کەسەی گیاکە هەڵ دەکەنێت. بۆ رزگاربوون یەك رێگا هەیە، ئەویش بەنێو گوڵەکانی حەوشەدا تێدەپەڕێت.



# سوهراب و جوانی

**سوهراب لەو شاعیرانەیە کە بەزۆر ڕێگای جیاواز هەوڵی دەربازبوونی لە تەقلیدیەت داوە، نەیویستووە شتەکان بەو جۆرە ببینێت کە پێشتر بینراون، بۆ نمونە جوانی لای سوهراب هەمان ئەو جوانییە نییە کە لای ئێمە هەیە، لای ئەو دەکرێت ئەگەر مرۆڤ چاوەکانی بشوات و تەپوتۆزی عادەت لەسەر ڕێی ڕوانین لاببات و عاشقانە بڕوانێتە زەوی، شتەکان بە جۆرێکی دیکە ببینێت. لای ئەو قەلە ڕەشەکان، دارکاژیان پێ دەبەخشرێت، قوڕباقە شکۆدارە و قەلە باچکەش بەسەر کێڵگەوە بە جیددی وەردەگیرێت. ئەو دەپرسێت:**

بۆچی ئەسپ حەیوانێکی نەجیبە و کۆتر جوانە و کەس لە قەفەسی خۆیدا داڵ ڕاناگرێت؟

گوڵی وێنجە چی لە گوڵاڵە سوورە کەمترە؟





**لای ئەم شاعیرە جوانی لە شێوەی شتەکاندا نییە، لە دەربڕینی عاشقانەی شێوەکاندایە:**

جوان یانی دەربڕینی عاشقانەی شێوەکان.

**واتە جوانی ئەوە نییە کە لە خودی شتەکاندا پەنهانە، بەڵکو ئەوەیە کە لە ڕوانینیی ئێمەدا پەنهانە، بە دەربڕینێکی دی، سەرچاوەی ڕاستەقینەی جوانی، شتەکان نین، بەڵکو ئێمەین. ئەمەیش دیسان، بەڵام بەجۆرێکی دی، گوێزانەوەی سەرنجە لەسەر شتەکانەوە بۆ سەر مرۆڤ خۆی، گوێزانەوەی سەرنجە لەسەر ئەو دنیایەوە کە مرۆڤەکان تیایدا دەژین، بۆ سەر ئەو دنیایەی کە لە مرۆڤەکاندا دەژی. جارێکی دی دووپاتکردنەوەی ئەو بڕوایەیە کە پێمان دەڵێت: ئەگەر مرۆڤەکان توانییان جوان بڕوانن، دنیا خۆی لە خۆیدا جوان دەبێت، ئەگەر دنیای ناوەوەی مرۆڤەکان جوان بوو، دنیای دەرەوەیان خۆی بۆ خۆی جوان دەبێت، ئەمەش بەردەوامبوون و درێژەدانە بەو ڕێگایەی سوهراب بۆ گۆڕین و جوانکردنی دنیا بڕوای پێ هەبووە.**

**ئەمە وەکو تێگەیشتنی سوهراب بۆ جوانی، وەکو تەعبیرکردنیش لە جوانی، سوهراب شێوازی تایبەت بە خۆی هەبووە، شێوازەکەیشی پەیوەندی بە کۆی شێوازی نوسینی ئەوەوە هەبووە، کە ناڕاستەوخۆیی لە سیما و خەسڵەتە دیارەکانێتی.**



**لای سوهراب ناڕاستەوخۆیی لە دەربڕیندا لە ئاستێکی بەرز دایە، هەر بۆ نمونە، کاتیٚ ویستویەتی باسی جوانی و ڕووناکی ژنێکمان بۆ بکات، لەبری ئەوەی بڵێت جوانە، یان بڵێت ڕووناکە، وتوویەتی:** لە دەسکەوانێکا نووری ئەکوتی!

**کاتی ویستویەتی پێمان بڵێت: مرۆڤ پێویستی بە هەندیٚ چرکەسات هەیە تیایاندا خۆی لەو کۆت و بەندانە بدزێتەوە کە بێئیرادەی دەکەن، بە یەك ڕستە وتویەتی:**

ژیان غەفڵەتی ڕەنگینی دەقیقەیەکی حەوایە.

**هەڵبەت دیارە کە حەوا لەو دەقیقەی غەفڵەتەدا چی کردووە و چۆن تەواوی پەیوەندی خۆی بە خودا و بە شوێنی ژیان و بە خودی ژیان و بە مردنیشەوە خستۆتە بەردەم سەرکێشییەك، کە وێڕای ئازار و نەهامەتییەکانی، هەرگیز لە جوانییش خاڵی نەبووە.**

**سوهراب، کاتیٚ ویستویەتی لەبارەی جوانی کچێکەوە بدوێت، کە لای ئەو (مەبەستم سوهرابە) وەك ئاسمان ساف و بێگەرد بووە، وتوویەتی:**

بە حەدیٚ لە تەماشای ئاسماندا توابۆوە،
کە ئاسمان لە چاوانییدا
گەرای دانا.

**کاتێك ویستویەتی پێمان بڵێت: بەیەکگەیشتنی جەستەیی، بۆ نمونە، دەستێك و دەستێکی دی، یان دەستێك و سینەیەك،**





**یاخود هەر کام لە ئەندامانی دوو جەستە، دەتوانێت ژیان ڕووناك بکاتەوە، وتویەتی:**

لە گفتوگۆی جەستەکانا ڕیٚی سپیدار،
چەند ڕووناک بوو..!

**کاتێکیش ویستویەتی پێمان بڵێت: ژنێك دەتوانێت دەقیقەکان، یان ڕاستتر، ژیان لە مەرگ وەربگرێتەوە و بە ئێمەی ببەخشێت، وتوویەتی:**

ژنیٚ گوێی لیٚ بوو
هاتە لای پەنجەرەکەوە سەیری وەرزی کرد.
لە سەرەتای خۆیدا بوو
دەستە سەرەتاییەکەشی، بە نەرمی
شەونمی دەقیقەکانی
لە جەستەی ئیحساسی مەرگ ئەچنییەوە.

**دەمەوێت کورت و پوخت بڵێم: سوهراب هەر تەماشاکردنی بۆ جوانی، لەگەڵ شاعیرانی دیکەدا جیاواز نەبووە، کە ئەو جوانی لە هەندێك شتدا بینیوە، شاعیرانی دی نەیان بینیوە، بەڵکو شێوازی تەعبیرکردنیشی لە جوانی، کە شێوازێك بووە ناڕاستەوخۆیی تیایدا گەیشتۆتە لوتکە، جیاواز بووە.**



# سوهراب و جیهانبینیی

لە ڕووی جیهانبینییەوە، وەك سیروس ئاماژەی بۆ کردووە، (ڕوانینی سوهراب تا رادەیەکی زۆر لە عیرفانی خوراسانییەوە نزیکە)[٦] بەڵام سوهراب لەو بوارەشدا کەسێکی تەقلیدیی نەبووە، نەیویستووە بە هەمان ئەو ڕێگایانەدا بڕوات کە عاریفانی پێش ئەو پێیدا ڕۆشتوون. جگە لەوەی لە خودی ڕوانیینە فەلسەفی و عیرفانییەکانیدا جیاوازی لەگەڵ عاریفانی بەر لە خۆی هەبووە، هەرگیز ئەوەیشی بیر نەچووە، کە ئەو شاعیرە و پێویستە لە هەموو بارێکدا خەونی گەورەی ئەو بەرهەمهێنانی شیعرییەت بێت، لای ئەو گەشتی شیعر لە شیعرەوە دەستی پێکردووە و بە شیعر کۆتایی هاتووە، ئیدی لەو نێوانەدا بە هەر ڕێگایەکدا گوزەری کردبێت، شیعرێتی خۆی لەبیر نەکردووە.





بێگومان قسەکردن لەسەر جیهانبینیی سوهراب، لەسەر عیرفان و ڕوانینە فەلسەفیەکانی، کارێکی تازە نییە، منیش بە هیچ جۆرێك نامەوێت لێرەدا ئەو قسانە دووبارە بکەمەوە کە لەم بارەیەوە کراون، ئەوەی بۆ من گرنگە و دەمەوێت لەم خوێندنەوەیەدا بەخێرایی ئاماژەی بۆ بکەم، ئەوەیە کە لە جیهانبینیی عاریفانەی سوهرابدا، لە بری خودا تەرکیز خراوەتە سەر مرۆڤ و لەبری مردنیش تەرکیز خراوەتە سەر ژیان.

ئەگەر پێشتر زۆرێك لە عاریفان لەبری مرۆڤ تەرکیزیان لەسەر خودا بووبێت و بۆ گەیشتنیش بە خودا پێویستیان بەوە بووبێت سەرەتا مرۆڤ بچووك بکەنەوە، پاشان ژیان بێنرخ بکەن و مردن پیرۆز بکەن، لای سوهراب هاوکێشەکە جۆرێکی دیکەیە، لەبری خودا، تەرکیز خراوەتە سەر مرۆڤ و لە بری مردنیش تەرکیز خراوەتە سەر ژیان.

مرۆڤ لە شیعری سوهرابدا نە چاو دەبڕێتە ئاسمان و نە چاوەڕوانی رزگارکەرێکی دوور دەکات، لەبری ئەوانە خۆی دەبێتە میحوەری ژیان و شتەکان و ڕووداوەکان.

لای سوهراب خودا لە ئەستێرەیەکی دوور نییە کە مرۆڤ تەنها لە ڕێگای مردنەوە پێی بگات، لای سوهراب خودا هێنراوەتەوە بۆ تەنیشتی مرۆڤ، بۆ نێو سرووشت و نێو باخەکان.

ڕێگای رزگاریی لای گوڵەکانی حەوشەوەیە و هەتاوێکیش لەبەر دەرگاکاندایە کە دەتوانێت رەفتاری مرۆڤەکان ڕووناك بکاتەوە.



ژیان بەلای سوهرابەوە ئەو دۆزەخە نییە کە مرۆڤەکانی لە خودا دابڕیبێت، بەڵکو بەلای ئەوەوە ژیان نەریتێکی خۆشە و لە دۆزینەوەی دەشاهیەك دەچێت لە جۆگەلەی شەقاما.

لای سوهراب مادام گوڵاڵە سوورە هەیە و نان هەیە و سفرە هەیە، دەبێت بیر لە مردن نەکەینەوە، دەبێت لە ژیان بەردەوام بین.

بێگومان ئەمەش جیاوازییەکی گەورە و ئاشکرایە لەگەڵ زۆرێك لەو عاریفانەی پێشتردا کە بڕوایان وابووە ((شتەکان لە ڕێی زمانەوە ناناسرێن، بەڵکو شتەکان لە ڕێی شتەکانەوە دەناسرێن، واتە خودا لە ڕێی خودا خۆیەوە نەبێت ناناسرێت، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو پەڕی زانیاریی، ئەگەر زانیاریی ئەو پەڕی هەبێت، لە مردن دایە، واتە عاریف، تا لە حزووری خودادا نەبێت، ناتوانێت خودا بناسێت))[٧]

زۆرێك لە عاریفانی بەر لە سوهراب بڕوایان وا بووە: کە ((ژیان نەخۆشییە و مەرگ دەرمانێتی، مەرگ جەژنی ژیانە، وەکچۆن میسك بە وردکردن بالاتر و بۆنخۆشتر دەبێت، مرۆڤیش بە لەناوچوون بالاتر دەبێت))[٨] کەچی لای سوهراب ژیان خاڵیی نییە، ژیان پڕە لە میهرەبانیی و سێو و ئیمان و گوڵاڵە سوورە، ئەوانەش بەسن بۆ ئەوەی مرۆڤ لە ژیان بەردەوام بێت.

لای سوهراب مردن نە پیرۆز دەکرێت و نە قێزەون، نە شتێکە مرۆڤ بەدواییدا ڕابکات و نە شتێکیشە مرۆڤ لە دەستی ڕابکات. لای سوهراب مردن ئاسایی تەماشا دەکرێت، مردن نە ئەوەیە مرۆڤ خۆزگەی پێ بخوازێت و نە ئەوەشە لێی بترسێت، چونکە مردن کۆتایی کۆتر نییە!



# سوهراب و عەشق

عەشق نەفرەتێکە لە سەردەمی ئادەم و حەواوە، بەر مرۆڤ کەوتووە و ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانی هەبووە و لە دیاریکردنی چارەنووسییدا ڕۆڵی بینیوە.

ڕەنگە عەشق تاکە نەفرەت بێت کە مرۆڤ خەونی پێوە بینیبێت و بە لایەوە جوان و دڵنشین و پیرۆز بوو بێت. عەشق لەوەدا نەفرەتە کە خودای لە مرۆڤ ڕەنجاندووە و لە بەهەشت بەدەرکردنی داوە و نەمریی لێ سەندۆتەوە، جوانی و دڵنشینی و پیرۆزیەکەیشی لەوە دایە مرۆڤی فێر کردووە لە بری بەهەشت و نەمرییەك کە خودا پێی بەخشیووە و ئەو تیایدا کاراکتەرێکی ناکارا و بێئیرادە و بێبڕیار بووە، بە دوای بەهەشتێکدا بگەڕێت کە لە خودی عەشقدا بوونی هەیە و خۆی بە دەستی دەهێنێت و تیایدا کارەکتەرێکی کارا و خاوەن ئیرادە و خاوەن بڕیارە.





بەسەرهاتی ئادەم و حەوا لە پشتی چەندین دەلالەتی قووڵەوە، چەندین حەقیقەتی گەورەمان بۆ دەگێڕێتەوە. ئەو بەسەرهاتە پێمان دەڵێت: عەشق ئەزەلی و گشتگیرە و لە خوێنی گشت مرۆڤەکاندا قووڵپ دەدات، پێمان دەڵێت: مرۆڤ خودای لە خۆی ڕەنجاندووە، بەڵام عەشقی لە خۆی نەڕەنجاندووە، دەستی لە بەهەشت و لە نەمریی هەڵگرتووە، بەڵام دەستی لە عەشق هەڵنەگرتووە.

پێمان دەڵێت: مرۆڤ کە (سێ) شتی گرنگی لە پێناوی عەشقدا دۆڕاندووە، (مەبەستم دڵی خودا و بەهەشت و نەمرییە)، تەنها لە ڕێی عەشقەوە دەتوانێت ئەو سێ شتە بە دەست بهێنێتەوە.

پێمان دەڵێت: عەشق وەکچۆن هۆکاری بەربوونەوەی مرۆڤە لە بەهەشتی بێ مردنی خوداوە، بۆ سەر زەوی بە مردن دەورگیراو، هەر ئاوهایش هۆکاری دووبارە گەیشتنەوەی مرۆڤە بە خودا و بە بەهەشت و بە نەمریی.

بەم مانایە عەشق گەڕانی سەرسەختانەی مرۆڤە بە دوای ئەبەدییەت و جاویدانییەکی هەمەلایەندا، نەفرەتێکی پیرۆز و جوان و دڵنشینە کە لە ئەزەلەوە بەر هەموو مرۆڤێك دەکەوێت، بەڵام لای هەر کەسە بەجۆرێك ڕەنگ دەگرێت و ڕەنگ دەداتەوە.

لای سوهراب، عەشق کە هێندەی پەڕ و باڵی حەقیقەت شینە، لەگەڵ لایلایەی منداڵییدا دەست پێ دەکات:

شاسوسا تۆیت..؟



درەنگ هاتیت:

لە لایلایەی منالّییەوە، تا ئەم چاوتێبڕینی هەتاوە،

من چاوەڕێی تۆ بووم.

**لای ئەم شاعیرە عەشق گەوهەری درەوشاوەی ناو لەپی زەوییە و پێغەمبەرەکانیش دووچاری سەرسوڕمان دەکات:**

لە ناو لەپی دەستی زەوییدا

گەوهەرێک هەیە پەنهانە

کە پێغەمبەران لە درەوشانەوەی سەریان سوورما.

**بە نسبەت ئەم شاعیرەوە:**

باشترین شت گەیشتنە بە نیگایەک

کە بە ڕووداوی عیشق تەڕ بووبێت...

**ئەوەی سەبارەت بە عاشقبوونی سوهراب بۆ من مایەی سەرنج و لەسەر وەستانە ئەوەیە کە لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ گومانێك لە عەشقی قووڵیی ئەو گومانێك نییە لە جێی خۆیدا بێت، کەچی سەیرە جگە لە شیعری (شاسوسا) و (بۆ باخی هاوسەفەران)، شیعرێك لەم کۆمەڵە شیعرەیدا نابینیت ڕاستەوخۆ بۆ عەشق نوسرا بێت و بە ڕوونی باسی کچێك یان ژنێکی تێدا کرابێت.**





**کە باسی عەشقی کردووە لە بەردێك، لە مەلێك، لە هەورێك، لە گەڵایەك، لە مشتێ خۆڵ، لە حەوزێك ئاو، یان لەهەر شتێکی دیکەی وەرپێچاوە، لە شیعری (سادە ڕەنگ)دا دەڵێت:**

ئافرەتەکەی دراوسێمان لە پەنجەرەکەیدا شاڵ ئەچنێ

لەبەر خۆیەوە گۆرانی ئەڵێ

من ((ڤیدا)) ئەخوێنمەوە ناو بەناویش

سکێچی بەردێ، مەلێ، هەورێ ئەکەم

**وەك دەبینین ئافرەتەکە شاڵ دەچنێت و گۆرانی دەڵێت، سوهرابیش ڤیدا دەخوێنێتەوە و وێنەی بەرد و مەل و هەور دروست دەکات، ئەوە چ جۆرە پەیوەندییەك بووە لە نێوانی سوهراب و ئەو ئافرەتەدا؟ بەبڕوای من ئەو پەیوەندییە، پەیوەندییەکی ئاسایی نەبووە، دەگونجێت پەیوەندیەکی زۆر قووڵیش بوو بێت، دەتوانین وای بخوێنینەوە شاڵی دەستی ئافرەتەکە سوهراب بووبێت و ڤیداکەی دەستی سوهرابیش ئافرەتەکە بوو بێت، وای بخوێنینەوە ئافرەتەکە گۆرانییەکەی بۆ سوهراب وتبێت و سوهرابیش وێنەکانی بۆ ئەو کێشا بێت، بەڵام سوهراب بە شێوازی خۆی، کە ناڕاستەوخۆیی لە سیما دیارەکانێتی، تەعبیری لەو پەیوەندییە کردووە. ئەم حاڵەتە تەنها لەو کۆپلەیەدا وا نییە، سوهراب زۆر جار لە باسکردنی ئافرەتدا، خۆی خستۆتە دەرەوەی باسکردنەکە، بۆ نمونە، لەبری ئەوەی لە**



**باسکردنی ئافرەتێکی شۆخدا بڵێ جوانییەکەی بەم، یان بەو جۆرە سەرسامی کردووم، وتویەتی:**

وا ئافرەتێکی شۆخ هاتە رۆخی روبارەکە

با ئاوەکە لێخن نەکەین

جوانی ڕوخساری دوو هێندە بووە.

**ئەمەش، دەشێت پەیوەندی بە دوو هۆکارەوە هەبێت:**

**یەکەم: لای سوهراب، ناڕاستەوخۆیی لە دەربڕیندا، مەرجێکی بنەڕەتیی بەرهەمهێنانی شیعرێتییە.**

**دووەم: ئادابی عاریفانە، دەخوازێت مرۆڤ جۆرێک لە ناڕاستەوخۆیی لە دەربڕینەکانییدا هەبن.**



## سوهراب و تەنیایی

تەنیاییش وەك عەشق، نەفرتێکە لەو نەفرەتانەی لە سەردەمی ئادەم و حەواوە بەر مرۆڤ کەوتووە، مرۆڤ لە ڕووی ڕوحییەوە، هەمیشە تەنیایە.

یەکەمین هەست کە لە ئادەمدا دروست بوو، هەستی تەنیایی بوو، ئادەم ئەگەرچی لە نێو بەهەشتێکی بێ مردن و لە تەنیشتی خودایشەوە بوو، بەڵام هەستی بە تەنیاییەکی قووڵ کرد، حەوا توانی تا ڕادەیەك فەرامۆشیی پێ ببخەشێت، بەڵام نەیتوانی هەستی تەنیایی لە ڕوحی بکاتە دەرەوە.

ئادەم بە هەشت و نەمریشی هەر لە پێناوی ڕزگاربوون لە تەنیایی لە کیس خۆی دا، کەچی هەستی تەنیایی ئەو هەر درێژەی کێشا و بە نێو ڕوحی نەوەکانیدا بڵاوبۆوە.





دەتوانین بپرسین: ئادەم و حەوا، بۆچی لەوەی بۆیان دیاری کرابوو زیاتر لە یەك نزیك بوونەوە؟ بۆچی فەرمانی خودایان شکاند و لە درەختە حەرامەکەیان خوارد؟ بۆچی و لە پێناوی چییدا ئامادە بوون دەست لە بەهەشت و لە نەمریی هەڵبگرن؟ بە بڕوای من هەموو ئەو کارانەیان لە پێناوی ڕزگاربوون لە تەنیایی ئەنجام دا، کەچی هەر لە تەنیایی ڕزگار نەبوون، هەستی تەنیایی ئەوان درێژەی کێشا و بە نێو ڕوحی نەوەکانیشیاندا درێژ بۆوە.

زۆر جار مرۆڤ بە جەستە تەنیا نییە، بەڵام بە ڕوح تەنیایە، تەنانەت جاری وا هەیە مرۆڤ لە قەرەباڵغترین شوێندا، قووڵترین هەستی بە تەنیایی هەیە.

لە ڕاستییدا عەشق جگە لە هەوڵدان بۆ ڕزگاربوون لەو هەستکردن بە تەنیاییە، شتێکی دیکە نییە، کەچی وەکو سوهراب دەڵێت: عاشقەکان هەمیشە تەنیان، بەیەك گەیشتن مەحاڵە و هەمیشە مەودایەك هەیە.

هەستکردن بە تەنیایی لای هەموو مرۆڤێك هەیە، بەڵام لای هەر مرۆڤە بە جۆرێك دەردەکەوێت. هەر مرۆڤە بە شێوازی تایبەتی خۆی دەری دەبڕێت.

لای سوهراب هەستکردن بە تەنیایی لە لوتکە دایە.

لای ئەو، مرۆڤ لە تەنیاییدا وەکو ماسییەکی بچکۆلە وایە تووشی ئاوی دەریایەکی بێسنوور بووبێت، لای ئەو، ژیان



**دەستدانە لە تەنیایی مانگ و کۆڵانی وەرز بۆنی تەنیایی لێ دێت.**

**سوهراب کە موسافیرێکی تەنیایە، لەو مرۆڤانەیە وا دەعوەتی دنیا قبوڵ دەکەن و بە دەنگییەوە دەچن و زۆر شت تاقی دەکەنەوە، بەڵام دواجار دەگەنەوە بە تەنیایی:**

من چووم بۆ دەعوەتی دونیا:
بۆ دەشتی غەم،
بۆ باخی عیرفان،
بۆ هەیوانی چراخانی زانست چووم.
بەسەر پلیکانەی ئایندا سەرکەوتم،
تا ئەو پەڕی کوچەی گومان،
تا هەوای فێنکی قانعبوون،
تا شەوی تەڕی موحیبەت چووم.
من بۆ دیداری کەسێ تا ئەو پەڕی عیشق ڕۆیشتم.
ڕۆیشتم، ڕۆیشتم ..هەتا ئافرەت
تا چرای لەززەت
تا کپبوونی ئارەزوو
تا دەنگی باڵەفڕێی (تەنیایی).





**لای سوهراب گەڕانیش بە دوای یاردا، کە لە بناغەدا هەوڵدانە بۆ ڕزگاربوون لە تەنیایی، دیسان مرۆڤ بۆ لای تەنیایی دەباتەوە:**

ماڵی یار لە کوێیە؟
ئەڕۆی تا کۆتایی ئەو کۆڵانەی کە لەو دیو باڵقبوونەوە
سەر دەردێنێ
ئینجا، بەرەو گوڵی (تەنیایی) پێچ ئەکەیتەوە
دوو هەنگاوت بۆ گوڵەکە ئەمێنێ
لای فوارەی نەمری ئەفسانەکانی زەوییەوە ئەمێنیتەوە
ترسێکی تەنک داتئەگرێ.

**لای سوهراب یەکێك لە ئامانجەکانی هونەریش، تازەکردنەوەی (دڵی تەنیایی) مرۆڤەکانە:**

خەڵکی کاشانم
پیشەم نیگارکێشانە.
جار جار قەفەسێ لە ڕەنگ دروست ئەکەم، بە ئێوەی ئەفرۆشم
تا بە ئاوازی ئەو گوڵاڵە سوورانەی کە تیایدا بەندن
دڵی (تەنیایی)تان تازە بێتەوە.

**لای سوهراب لەو پەڕی سەرسامبوونیشدا بە دەنگی مەل و باڵندەکان، تەنیایی هەر واز لە مرۆڤ ناهێنێ:**



تا کلاوکورپەک ئەیخوێند،

سینە لە تامەزرۆیی بیستنا ئەسووتا.

جار نا جارێکیش (تەنیایی)

دەموچاوی بە پەنجەرەکەوە ئەنا.

**سوهراب دەیەوێت لە ڕێی ئەم نمونانەوە پێمان بڵێت: نە عەشق و نە هونەر و نە سەرسامبوون بە دەنگی باڵندەکان و نە هیچ شتێکی دی ناتوانن مرۆڤ لە تەنیایی ڕزگار بکەن.**

**هەستی تەنیایی بە ڕادەیەك لە سوهرابدا زاڵە، کە گلەیی ئەو لە مەرگ بۆ ئەوە نییە نەیهێشتووە شیعری فروغ بگاتە ترۆپکی هەڵکشانی خۆی، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە فروغی ڕفاندووە و ئەمانی بە تەنیا هێشتۆتەوە:**

ڕۆی تا رۆخی هیچ و

لەو دیو حەوسەڵەی ڕووناکیەکانەوە درێژ بوو.

هیچ بیریشی لەوە نەکردەوە

کە ئێمە لە نێو پەرێشانیی لەفزکردنی دەرگاکانا،

بۆ خواردنی سێوێک،

چەند (تەنیا) ماوینەتەوە.



## سوهراب و سروشت

**ئەستەمە بتوانیت شیعرێکی سوهراب بدۆزیتەوە سروشت تیایدا یەکێك لە پێکهێنەرە سەرەکی و دیار و خاوەن جەبەرووتەکان نەبێت. ئەمەش جگە لەو ڕەهەندەی پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد کە وتمان دەیەوێت لەڕێی هاوتاکردنەوەی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا ژیان سادە بکاتەوە و گۆڕانی بەسەردا بهێنێت، چەند ڕەهەند و ئاستێکی دیکەشی هەیە. لە وانە: بەکارهێنانی سروشت وەك بەشێکی زیندوو لە ناو ژیانی مرۆڤدا، واتە سروشت لە شیعری سوهرابدا سرووشتێکی ڕووت و بێ ژیان و بێ گیان نییە و ڕۆڵی لە نێو ژیاندا، تەنها بەخشینی جوانی و سەرسامکردنی مرۆڤ نییە. با بزانین چۆن؟**

**سروشت لە شیعری سوهرابدا هەندێجار بوونێکی دایکانەی هەیە و باسکردنی ئەو لەگەڵ باسکردنی دایکدا ئاوێزان دەبێت،**





**گەڵاکانی ئەو لەگەڵ لایلایەکانی دایکدا لەیەك دەچن و نەغمەکانی دایکیش لە نەغمەی لەرینەوەی گەڵاکانی ئەو دەچن:**

درەختی ئەکاکیا لە ڕووناکی چراکەدا وەستاوە.

گەڵاکانی خەوتوون، لە لایلایە دەچن.

گوێم لە دەنگی دایکمە.

خۆر ئاوێتەی پەنجەرەکە بووە.

نەغمەی دایکم، لە نەغمەی لەرینەوەی گەڵاکان دەچێت.

***

گەڵایەک کەوتە سەر فەرامۆشیی دەستم: گەڵای ئەکاکیا..!

بۆنی گۆرانییەکی ونبووی لێدێ، بۆنی ئەو لایلایەیەی

کە بەسەر ڕوخساری دایکمدا دێت و دەچێ.

**هەندێجار سروشت، بەهەمان سیفەتی دایکانە، یاخود وەکو دڵدارێك، لە کاتی نەخۆشییدا، بە دەنگ سوهرابەوە دەچێت:**

هەندێجار کە تام لێهاتووە بینیوومە مانگ دێتە خوارێ.

**هەندێجاریش دیمەنێکی ئەو (مەبەستم سروشتە)، برینەکانی سەر ڕوخساری هەستی سوهراب سارێژ دەکات:**

حزووری ڕەنگاڵەیەک لە وێنجەکانا

ڕووشانی ڕوخساری هەستی سارێژ ئەکرد.



**هەندێجاری دیکەش ئەوەی سوهراب خەبەر دەکاتەوە و زەینی دەبووژێنێتەوە، سروشتە:**

من لە شکۆفەی گوڵی یاسێکدا،

لەو دیو پەنجەکانی تۆوە بێدار دەبمەوە.

زەینیش رووی رۆشنی گوڵی بە دەستەوە گرتبوو

خۆی پێ باوەشێن دەکرد.

**لە هەندێ شوێندا سروشت لە ژیانی سوهراب دەئاڵێت و ڕەگی تێدا دادەکوتێت و ژیانی ئەم (واتە سوهراب)، لە ناو دەمارەکانی ئەودا، (واتە سروشت) دەگوزەرێت و مردنیشی لە شکۆفەکردنی ئەودا ڕوو دەدات:**

نیلۆفەرەکە لە هەموو ژیانم ئاڵا بوو

ئەوە من بووم بە دەمارەکانی ئەودا گوزەرم ئەکرد

ڕەگی لە بوونی مندا داکوتا بوو

***

دەتوت پەیتا پەیتا ئەڕژێتە ناو ناخمەوە و

منیش لە دەنگی شکۆفەکردنی ئەودا

پەیتا پەیتا ئەمرم.

**تەنانەت لە هەندێ جێگادا پەیوەندی سوهراب بە سروشتەوە دەگاتە ئاستی دۆناودۆنکردن:**

لە هەر شوێنێ

کە پارچەیەکی منی تیا مردبوو

نیلۆفەرێک رووا بوو.





**نەك هەر ئەمە، سوهراب هەست دەکات ڕەچەڵەکیشی هەر بۆ سروشت دەگەڕێتەوە:**

ئەشێ ڕەچەڵەکم بچێتەوە

سەر گیایەک لە هند.

**سوهراب هەوڵی داوە لە هەموو ئاستەکاندا مامەڵەی جیاواز لەگەڵ سرووشت بکات، سروشت لای ئەو تەنها ئەو وەزیفەیەی نییە کە لای زۆرینەی شاعیرانی دیکە هەیەتی –مەبەستم سەرسامبوونە بە جوانییەکانی سروشت– لە شیعری ئەم شاعیرەدا خۆر وێڕای بەخشینی گەرمایی و ڕوناککردنەوەی بەرچاوی مرۆڤ ڕەفتاریشیان ڕوناك دەکاتەوە:**

هەتاوێ وا لەبەر دەرگاتاندا

گەر دەرگاکە بکەنەوە

ڕەفتارتان ڕووناک ئەکاتەوە.

**لای سوهراب، داو بۆ ئاسمان دەنرێتەوە و دەخرێتە ناو پەرداخە ئاوەوە و دەخورێتەوە:**

دەرگاکەم کردەوە بەشێک لە ئاسمان کەوتە پەرداخی ئاوەکەمەوە

ئاوەکەم بە ئاسمانەوە خواردەوە.



**لای سوهراب، لە سێوێکدا ڕووخسار و لە بنچکی خەشخاشێکدا خۆشووشتنی مرۆڤ ڕوو دەدات:**

- لە چ سەر زەمینێکیش بوو

کە لەسەر هیچ دانیشتین و

لە گەرمی سێوێکدا ڕوخسارمان شت؟

بنچکی خەشخاشێ منی لە سێلاوی بووندا شت.

**لای سوهراب تریێ-ش وەکو خۆر هەڵدێت:**

کابرایەک لە منی پرسی

تا هەڵهاتنی تریێ، چەند سەعات ڕێ ماوە؟

**دەمەوێت بڵێم: لای سوهراب وێڕای سەرسامبوون بە جوانییەکانی سروشت، زۆر کاری دیکەی پڕ لە هەستی ئیستاتیکیانە بە سروشت دەبەخشرێت، سەرجەم ئەو کارانەیش کە لە شیعری سوهرابدا بە سروشت دەبەخشرێن، لە یەك ئامانجی گەورەی ئیستاتیکییدا یەك دەگرنەوە، کە ئەویش ڕزگارکردنی شیعرە لە ڕاستەوخۆیی و دەربڕینی ڕووکەشیانە، بریتییە لە بەخشینی قوڵایی و دوورایی دیکە بە شیعر.**

**ڕاستە شیعری سوهراب لە ڕووکاردا سادەیە و وا خۆی دەنوێنێ کە جۆرێك لە ڕاستەوخۆیی تێدا بێت، بەڵام لە جەوهەردا شیعرێکی قووڵە، شیعرێکی ناڕاستەوخۆ و سرك و سەراب ئاسایە، شیعرێکە نزیك دێتە بەرچاو، بەڵام دوورە.**





**شیعرێکە بەردەوام هەوڵی نزیکبوونەوە لەو شتانە دەدات کە ناوترێن، هەوڵی گرتنی ئەو وێنانە دەدات کە ناگیرێن. شیعرێکە لە شوێنێکدا دەوەستێت و مەبەستی شوێنێکی دیکەیە، لەم ڕووەوە دەتوانین وەکو بلاجکتۆرێکی تەماشا بکەین، کە خۆی لێرەیە، بەڵام تیشك دەگرێتە شوێنێکی دیکە، خۆی لێرەیە، بەڵام شوێنێکی دیکە ڕووناك دەکاتەوە، خۆی لێرەیە، بەڵام لە شوێنێکی دیکە بەدوای شتی دیکەدا دەگەڕێت.**



## سوهراب و هارمۆنیای گەردوونیی

سوهراب بڕوای بە هارمۆنیایەکی گەردوونیی هەبووە لە نێوان سروشت‌و مرۆڤ و شتەکاندا، بۆ پاراستنی ئەو هارمۆنیا گەردوونییە، مرۆڤی هانداوە گاڵتەی بەهیچ شتێك نەیەت و هیچ شتێك بە زیادو بێکەڵك‌و بێبەها تەماشا نەکات، ئەو پێی وابووە بێڕێزکردن‌و توڕهەڵدانی هەر شتێك دەتوانێت بەشێك لەو هارمۆنیا گەردوونییە تێك بدات کە سەرجەمی شتەکانی بە گەورە و بچوك و جوان و ناشیرین و بەکەڵك و بێکەڵکەوە لەناو خۆیدا جێ کردۆتەوە:

گەر فەلسەفەیەک مانگ بکا بەدوو لەتەوە پێناکەنم.

ئەگەر کرم نەبوایە ژیان شتێکی کەم دەبوو.

ئەگەر کرمۆکەش نەبوایە قانونی درەخت ئەشێوا.

بەر لە مەرجان چۆڵەوانییەک لە ئەندێشەی دەریاکاندا هەبوو.





لە شیعری سوهرابدا، بەردەوام خەم و هیوا پێکەوە ئامادەییان هەیە، ئەو بەردەوام خەمبار و تەنیایە و بەردەوامیش دڵی بە شتێك خۆشە، پاراستنی ئەم دوو ئیقاعە لە یەك ئەزموونداو بە شێوەیەکی بەردەوام، یان نیمچە بەردەوام، یەکێك لە خەسڵەتە تایبەتییەکانی شیعری سوهرابە و پەیوەندی قوڵیی بەو هارمۆنیا گەردوونییەوە هەیە، کە ئاماژەمان بۆ کرد. سوهراب لەو شاعیرانە بووە کە نەیویستووە ئەو هارمۆنیایە تێك بدات، ئەو نەیویستووە شتێك بکات لەدەرەوەی قانوونی زەوی.

لە نێو ئەو هارمۆنیایەدا هەم عیشق وەك پەڕوباڵی راستگۆیی شین چۆتەوە و هەم (نائومێدیی رەنگاوڕەنگ)یش بوونی هەبووە.

لە نێو ئەو هارمۆنیایەدا هەم لە تەنیایی مرۆڤدا سێبەری نارەوەن تا ئەبەد درێژ بۆتەوە، هەم گوڵەکانی ئەکاکیا لە لایلایەی دایکە میهرەبانەکاندا شکۆفەیان کردووە.

لەو هارمۆنیایەدا بۆی هەبووە مرۆڤ هەم لە تامی مەقامێك تەنیاتر بێت، هەم بۆی هەبووە دڵی بە سێوێك، بە بنچکێ بەیبوون خۆش بێت، توانیویەتی هەم لە دەقی پەیبردن بە کوڵانێ تەنیاتر بێ، هەم بە ئاوێنەیەك، بە پەیوەندییەکی پاك قایل بێت.

لەو هارمۆنیایەدا هەم جاری وا بووە مەرگ لە سێبەردا دانیشتووە و لە مرۆڤەکانی ڕوانیووە، هەم جاری وایش بووە سیماکان لە ئاوی زیوییندا بە مەرگ پێکەنیوون.



لەو هارمۆنیایەدا بۆی هەبووە پارچەیەك لە مرۆڤەکان بمرێ،
بەڵام کە ئەوە ڕووی داوە نیلۆفەڕێك ڕواوە.

تەنیایی هەبووە و بە یەك گەیشتن مەحاڵ بووە و هەمیشە
مەودایەك هەبووە، بەڵام دەستی کراوەی ڕوناکییش لەسەر شانی
(گیا)کان بووە.

دەروونی تەنیا هەبووە، بەڵام هەر ئەو دەروونە تەنیایە،
چاوەکانی بە خۆرەوە و دڵەکانیشی بە عیشقەوە گرێ داوە.

قوڵایی خەم هەبووە، بەڵام گیای سەوز و سەیری تیا ڕوواوە.

لەو هارمۆنیایەدا ڕوحی بێکار هەبووە، بەڵام لاو بووە.

فەسڵی غەمگین هەبووە، بەڵام ژیانیش عادەتێکی خۆش بووە.



## سوهراب و زمان و وێنەی شیعریی

من لە بۆنەیەكی دیكەشدا وتوومە: لای ئێمە، زۆرجار شتەكان تێكەڵ دەكرێن، بۆ نمونە تا ئێستاش لای زۆرێك لە خەڵكانی ئێمە زمانی شیعریی، یان شاعیرانە، بەو زمانە دەزانرێت كە كێش و سەروای هەبێت، بەلام لە راستییدا، ئەگەرچی كێش و سەروا بۆ شیعر بە گشتیی بایەخی خۆیان هەیە، وەلێ هەرگیز ناتوانن زمانێكی ئاسایی بكەن بە زمانێكی شیعریی.

زمانی شیعریی، ئەو زمانەیە كە تیایدا وشە و دەستەواژە و دەربڕینەكان، لە ڕێی بەكارهێنانی میتافۆرەوە، لە وەزیفەی ئاسایی و رۆژانەی خۆیان سەرووتر دەچن و وەزیفەی نوێ و جیاواز وەردەگرن. دیارە كاری سەرەكی میتافۆریش كە روحی هەموو زمانێكی شیعرییە، ((گەیاندنی ئێمەیە بە ڕەهەندی نەبینراوی شتەكان))[9]





چونكە ((شیعر زمانێكە تەنها ئەو شتە دەرنابڕێت كە دەیخاتە ڕوو، بەڵكو شتێكی دیكەی نەبینراو و گریمانەیی-ش دەردەبڕێت، ڕەهەندی پڕ بایەخی شیعریش ئەو شتەی دیكەیە))[10]

هەموو زمانێكی شیعرییش كە لە ڕێی میتافۆرەوە دروست دەبێت، پەیوەندی ڕاستەوخۆ و جیانەكراوەی بە وێنەی شیعرییەوە دەبێت، كە ئەویش -مەبەستم وێنەی شیعرییە- زۆرجار لای ئێمە بە هەڵە لەگەڵ لێكچووندا تێكەڵ دەكرێت.

((لێكچوون دوو شتی هەستپێكراو پێكەوە كۆدەكاتەوە و پردی نێوان شتەكان وەك خۆی دەهێڵێتەوە، لەبەرئەوە لێكچوون دووركەوتنەوەیە لە جیهان، بەلام وێنە ئەو پردە دەڕوخێنێت چونكە شتەكان كۆدەكاتەوە، ئەو كە یەكگرتن لەگەڵ شتەكاندا دەڕەخسێنێت، بواریش دەڕەخسێنێت شتەكان ببن بە هی ئێمە))[11]

دەمەوێت بڵێم زمانی شیعریی بە پەنابردن بۆ میتافۆر، كە بەخشینی وەزیفەی نوێ بە وشە و دەربڕین و دەستەواژەكانی لێ دەكەوێتەوە، دەتوانێت لەو شتانەمان نزیك بخاتەوە كە ناوترێن، دەتوانێت بمانباتە تەنیشتی ئەو وێنانەی كە ناگیرێن، ئەمەش زیاتر لە ڕێی ئەو وێنە شیعرییانەوە بەرهەم دێت، كە تیایاندا شتگەلی هەستپێكراو و هەستپێنەكراو، یان شتگەلی بینراو و نەبینراو، پێكەوە كۆدەكرێنەوە.



شیعرییش لە بناغەدا، وەك ئەدۆنیس ئامارژەی بۆ دەكات:
((جگە لە هەوڵدانی مرۆڤ بۆ وتنی ئەو شتانەی ناوترێن لە ڕێی میتافۆر و هێماوە، شتێكی دیكە نییە))[١٢]

لە دەرەوەی زمان و وێنەی شیعریی، لە ناو زمانی ئاسایی و وێنەی ئاساییدا، نە ئاو دەتوانێت سەرینی نیلۆفەر بێت و نە (خەوی تەڕ) بوونی هەیە و نە میوە ژاوە ژاو دەكات و نە گیا هۆشی هەیە و نە هۆشی گیا دەنگی هەیە و نە ئاو بیرەوەری دەریایە.

ئەوەی ڕەنگ بە بێڕەنگی دەبەخشێت و غوربەت ڕەنگین و دەقیقەكان بۆنخۆش دەكات و دەتوانێت ئاوازی حوزن ببیسێت، زمانی شیعریی و وێنەی شیعرییە.

لەم ڕووەوە، –مەبەستم باڵادەستییە لە زمان و وێنەی شیعرییدا– سوهراب لە شاعیرە مەزنەكانە.

لای سوهراب ئاو پێی هەیە و مرۆڤ دەتوانێت دەنگی پێی ببیسێت، دەمەقاڵێی ژەنگاوی لە نێوان ئاو و زەوییدا هەیە.

ئاو لە درزی بەردەکانەوە دەپژمێ

تاریكیی دەنگی هەیە و كاتێ لە گەڵایەكەوە دەكەوێت دەتوانین، ببیستین.

ڕوناکی لەو دیوی درەختەوە دەکۆکێت.
قیتار لە خەوی پرددا پێچ دەکاتەوە.





خەوی مرڤەكان دەڕژێتە قەراغی پەتۆكان و شەماڵ گسكی دەدا.

دەتوانین لە دنیاكەی سوهرابدا، دەیان و سەدان دەستەواژەی پڕ لە شیعرێتیی لەم جۆرە ببینین:

گیای شەكەتیی، زەمیلەی پڕ لە خەون، باری زەردەخەنە، سەتڵی پڕ لە شەونم، نەسیمی تینوێتیی، دەنگی هۆشی گیا، بێدەنگیی سەوز، غوربەتی ڕەنگین، دەقیقەی بۆنخۆش، ئاوازی كێشداری حوزن، خەونی تەڕ، خوێنی غەمگین، دەماری ئاواز، گەنجێتیی سێبەر، مناڵیی سوێری ئاو، خەوی سەوز، زەینی با، ڕوخساری هەست، هۆشیاریی خەو، كوڕی ڕۆشنی ئاو، ڕوخساری زێڕینی مەرگ، غوربەتی تەڕ، كوێستانی زەین، دەستی با، ویژدانی چیمەن، بێگەردیی ڕژاو، هێلانەی نوور، منارەی دار سەروو، ئیزرەمی دڵخۆشیی، بازنەی سەوزی بەختەوەریی، فەرامۆشیی دەست، باڵەفڕێی تەنیایی، باڵقبوونی خۆر، گوڵستانی شەهوەت، سەكۆی تەجەلا، مۆسیقای غەمناكی پێگەیین، شوشەی شادیی، بۆنی تەنیایی، پردی خەو، گومناوی شەونماویی هەناسەی باخچە، تامی ڕۆشنایی، عادەتی سەوزی درەخت، گوڵاوی فەرامۆشیی، ساپیتەی نادیاری كات، نەسیمی سەوز، تانوپۆی خەون، تریفەی تەنیایی، بەرخی ڕۆشن، دڵۆپەی كات، گوناهی نورانیی، ئێسقانی ڕۆژ، غەفڵەتی پاك،



## سوهراب و خەسڵەتی بروسکەیی

دواجار، شیعری سوهراب نە شیعری هوتافکێشان‌و نە شیعری خوتبەدانە، نە شیعرێکە راستەوخۆ شتەکان دەر ببڕێت و نە شیعرێکیشە درێژدادڕی و چەندبارەکردنەوە لەخۆ بگرێت، بەڵکو شیعرێکە زیاتر کار لەسەر چڕکردنەوەو ناڕاستەوخۆیی‌و ئیحابەخشین دەکات، شیعرێکە خەسڵەتی بروسکەیی لە خەسڵەتە دیارەکانێتی. شیعرێکە تیایدا:

به تەنها ئاماژەیەک بەسە.

بۆ نمونە: کاتێ باسی پەڕینەوەی مێش دەکات لە کوچەی تەنیاییدا، لە راستییدا باسی تەنیایی مرۆڤ دەکات، بەڵام بە ڕستەیەکی ئاوها کورت و ناڕاستەوخۆ، دەری دەبڕێت.

کاتێ باسی مێرووییەک دەکات کە لە بنی شەودا دیووە زیندووەکەی تەنیایی تاقی دەکاتەوە، دیسان باسی تەنیایی





مرۆڤ دەکات، بەڵام بەو شێوەیە سەرنجی خوێنەری بۆ رادەکێشێت.

کاتێ دەیەوێت رەخنە لە سیستمی پەروەردەیی بگرێت، بەیەک دەستەواژەی کورت‌و پڕ لە ماناو پڕ لە دەلالەت، ئەو پەیامە دەگەیەنێت:

منالێ بەردی ئەگرتە مەکتەب.

بۆ رەخنەگرتنیش لە کلتوور و داب و نەریت، دەڵێت:

منالێ ناوکە قەیسی بەسەر بەرماڵە بێڕەنگەکەی باوکیا تف ئەکردەوە.

کاتێکیش دەیەوێت رەخنە لە سیاسەت بگرێت، دەڵێت:

قیتارێکم دی سیاسەتی ئەبردو (چەند بەتاڵ ئەڕۆیی).

لەبارەی فیقهیشەوە دەڵێت:

قیتارێکم دی فیقهی ئەبردو (چەند قورس ئەڕۆیی).

دیسان لە بارەی فیقهەوە دەڵێت:

من هێندەی هەورێ دڵم تەنگ ئەبێ
کاتێ لە پەنجەرەکەوە دەبێنم (حۆری)
کچە عازەبەکەی دراوسێمان
فیقە دەخوێنێتەوە.



**لە بارەی نەبینینی دەسکەوتە گەورەکانی مرۆڤەوە، کە بە بڕوای من، وێڕای هەر تێبینییەک، یاساکانی حامورابی یەکێک لەو دەسکەوتە گەورانەیە، دەڵێت:**

منداڵە کوێرە عێراقییەکان
ئەیان ڕووانییە لەوحەکەی حامورابی.

**لە بارەی وازنەهێنان لەو ڕوحە داگیرکارەی لە سەردەمانێکی کۆنەوە، لە مرۆڤدا هەبووە، دەڵێت:**

هێشتا حیلەی ئەسپە نەسرەوتەکانی مەغۆل
لە خەڵوەتی کێڵگەکانی وێنجەوە بەرز ئەبێتەوە.

**لە بارەی ئەو کەسانەیشەوە کە بێدەربەستانە شت فڕێ دەدەن و گوێ بەو هارمۆنیا گەردوونییە نادەن کە سوهراب بڕوای پێ هەبووە ، دەڵێت:**

قوتووی خاڵیی خۆراکی ئامادەکراو
گەرووی جۆگەلە ئاوەکەی بریندا ئەکرد.

**وەک دەبینین لە چەند دێڕێکی کورت و بروسکەیی و پڕ لە ئاماژەدا لەسەر زۆر باس و خواسی گرنگ گۆشەیەک لە ڕوانینی خۆی بۆ ئاشکرا کردووین.**

**بە کورتی، بەڵام دەستڕەنگینانە، دەستی بۆ زۆر دۆزی گرنگ بردووە. لێرەوەیە کە دەڵێین خەسڵەتی بروسکەیی لە خەسڵەتە دیارەکانی شیعری سوهرابە.**



# ئەنجام

ئیستا دەتوانین ئەنجامی خوێندنەوەکەمان بۆ دنیای سوهراب، لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا چڕ بکەینەوە:

یەکەم: سوهراب شاعیرێکی گەردوونییە و لەوە تێپەڕیووە تەنها وڵاتی ئێران و نەتەوەی فارس بە موڵکی خۆیانی بزانن، ئەو جگە لەوەی هەڵگری خەم و خەون و خۆزگەگەلێکە کە زۆرێك لە مرۆڤەکانی دنیا تیایدا هاوبەشن، خاوەنی زمانێکی شیعریی وایشە کە دەتوانێت بەناو سەردەمە جیاجیاکاندا تێبپەڕێت و بە مرۆڤی نەتەوە و نیشتمانە جیاوازەکان بگات.

دووەم: شیعری سوهراب شیعرێکی دابڕاو نییە لە واقیع، بەڵام بە هەمان کەرەستەی شاعیرانی دیکەش مامەڵە لەگەڵ واقیع ناکات، ئەم بۆ گۆڕینی ئەو واقیعەی مرۆڤ دەهاڕێت، ڕێگا و شێواز و کەرەستەگەلی تایبەت بە خۆی هەیە.





لای ئەم گۆڕینی مرۆڤ لە ڕێی گۆڕینی دنیاوە ڕوو نادات، بەڵکو گۆڕینی دنیا لە ڕێی گۆڕینی مرۆڤەوە ڕوو دەدات.

سێیەم: لای سوهراب جوانی لە خودی شتەکاندا نییە، لە ڕوانینی ئێمە دایە بۆ شتەکان، جوانی لە شێوەی شتەکاندا نییە، لە دەربڕینی عاشقانەی شێوەکان دایە، لەبەر ئەوە ئەو پێی وایە ئەگەر چاوانمان بشۆین دەتوانین دنیا و جوانییەکانی بە جۆرێکی دیکە ببینین.

چوارەم: جیهانبینیی سوهراب جیهانبینییەکی عاریفانەیە، بەڵام بە شێوەیەکی تەقلیدی نا، لای ئەم بە پێچەوانەی زۆرێك لە عاریفەکانەوە، لەبری ئەوەی تەرکیز لەسەر خودا بێت و خودایش لە ئەستێرەیەکی دوور بێت و مرۆڤیش بۆ گەیشتن بەخودا تەنها ڕێگەی مردنی لەبەردەم بێت، خودا لە تەنیشتی مرۆڤەوەیە، لە ناو گوڵ و باخچەکان دایە، لەبەر ئەوە لەبری مردن ژیان پیرۆز کراوە.

پێنجەم: سوهراب عاشق بووە و عەشق لای ئەو لە لایلایەی منداڵییەوە دەستی پێکردووە و بە گەوهەرێك زانراوە لە ناو لەپی دەستی زەویدا کە پێغەمبەران سەریان لە دەرەوشانەوەی سوڕماوە، کەچی لە تەواوی ئەو دیوانەیدا کە ئێمە کارمان لەسەر کردووە، جگە لە شیعری (شاسوسا) و (بۆ باخی هاوسەفەران) شیعرێك نابینین ڕاستەوخۆ لە عەشق بدوێت و بۆ



ژنێك نوسرابێت، ئەو بەردەوام عەشقی خۆی لە گەلاَیەك، لە مشتیَ خوَلَ، لە حەوزیَ ئاو، لە دەنگی مەلێك، یان لە هەر شتێکی دیکە وەرپێچاوە و بە سیغەی ناڕاستەوخۆ باسی عەشقی کردووە، ئەمەش دەشێت پەیوەندی بەو بڕوایەی سوهرابەوە هەبووبێت کە پێی وابووە ڕاستەوخۆیی شیعر دەکوژێت، دووریش نییە پەیوەندی بە ئادابی عاریفانەی خودی شاعیرەوە هەبوو بێت.

شەشەم: سوهراب کەسێکی هەمیشە تەنیا بووە و هەستکردن بە تەنیایی لای ئەو لە لوتکەدا بووە.

لە شیعری سوهرابدا گەشتی مرۆڤ لە هەر جێگایەکەوە دەست پێبکات بە تەنیایی کۆتایی دێت، چونکە بە بڕوای ئەو بەیەکگەیشتن مەحاڵە و هەمیشە مەودایەك هەیە.

حەوتەم: سرووشت لای سوهراب لەو ڕەگەزە ئامادانەیە کە سەرتاپای شیعرەکانی داپۆشیووە، ئامادەیی سرووشتیش لای ئەو ڕەهەند و ئاستی جیاجیای هەیە، لە هەمووشیان گرنگتر ئەوەیە کە سوهراب سرووشتی وەکو ڕێگایەك بۆ دوورکەتنەوە لە دەربڕینی راستەوخۆ و ناشیعریی بەکار بردووە. سرووشت لای سوهراب قووڵایی و دوورایی دیکە بە وێنە و دەستەواژە شیعرییەکان دەبەخشێت.





هەشتەم: سوهراب بڕوای بە هارمۆنیایەکی گەردوونیی هەبووە کە تیایدا زۆر شتی دژبەیەك و لێکجیا کۆدەبنەوە، ئەمەش وای کردووە لە شیعری ئەودا بەردەوام هەم خەم هەبێت و هەم هیوا.

نۆیەم: لە رووی زمان و وێنەی شیعرییەوە، سوهراب لەو شاعیرانەیە کە توانیوویەتی دەیان و سەدان دەستەواژە و وێنەی شیعریی پەتییمان پێشکەش بکات، لە دەستەواژە و وێنەی شیعریی پەتی مەبەستم ئەو دەستەواژە و وێنە شیعرییانەیە کە تیایاندا لە ڕێی بەیەك گەیاندنی شتگەلی بینراو و نەبینراو، شتگەلی هەستپێکراو و هەستپێنەکراوەوە، دەستەواژە و وێنەگەلێك داهێنراون کە لەدەرەوەی زمانی شیعریی و وێنەی شیعریی، بینین و گرتنیان جۆرێکە لە مەحاڵ.

دەیەم: سوهراب زۆرێك لە شتەکانی هێند بە کورتی، بەڵام هێند بە جوانی دەربڕیوە، کە مرۆڤ سەرسام دەکات، لێرەوەیە کە خەسڵەتی بروسکەیی دەبێت بە یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی شیعری ئەو.



## سەرچاوەو پەراوێز:


١- محەمەد کوردۆ، لالەزاری وشە، کۆمەڵێك رەخنەو بابەتی ئەدەبییە، (بەڕێوەبەرێتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی ٢٠٠٧)، ل٢٣٦

٢- عبدالعزيز بومسهولي. الشعر والتأويل: قراءة في شعر أدونيس (افريقيا شرق: ١٩٩٨) ص١٣١-١٣٢

٣- محەمەد کوردۆ، لالەزاری وشە، ل٢٣٦.

٤- ادونيس، النظام والكلام، الطبعة الثالثة، (بيروت: ١٩٨٠)،ص٥٨.

٥- نزار قباني، قصتي مع الشعر، الطبعة الاولى (منشورات نزار قباني، بيروت: ١٩٧٣ )ص١٩.

٦- عاشق هەمیشە تەنیایە، ژیان و شیعری سوهراب سپهری، وەرگێڕانی ئازاد بەرزنجی،( چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی:٢٠٠٦)، ل٥٧.







٧- ادونيس الحوارات الكاملة، الجزء الاول (دار الطليعة الجديدة، دمشق:٢٠٠٥)، ص١٧١

٨- ادونيس، مقدمة للشعر العربي، (وزارة الثقافة، دار البعث: ٢٠٠٤)، ص٨٠

٩- ادونيس، الصوفية و السوريالية، الطبعة الاولى (دار الساقي، بيروت: ١٩٩٢)ص١٤٤.

١٠- ادونيس، زمن الشعر، (دار الساقي، بيروت: ٢٠٠٥)، ل٦١

١١- ادونيس، زمن الشعر ص٢٦١.

١٢- ادونيس، الصوفية و السوريالية، ص.٢٤




# هەنوكە لەسەفەردام

## خوێندنەوەی نامە و بیرەوەرییەكانی سوهراب

یەكەمین وێستگەی ئاشنابوونی من لەگەڵ دنیای سوهراب سپیهریدا بۆ سەرەتای نەوەدەكان دەگەڕێتەوە، كە بۆ یەكەمینجار نامیلكەی (دەنگی پێی ئاو)م بە وەرگێڕانی ڕێبوار سیوەیلی دەستكەوت و لەدەفتەرێكدا نوسیمەوەو تا ئێستاش پاراستوومەو خۆشمدەوێت و بەیەكێك لە یادگارە جوانەكانی ژیانی خۆمی دەزانم. پاشان (تریفەی تەنیایی)و (سوهراب باڵندەی كۆچەر)م بینی كە یەكەمیان كۆمەڵێك شیعری سوهراب و یەك دوو وتاری لەسەر دنیای سوهراب تێدایە و ئازاد بەرزنجی كردوویەتی بەكوردی و دووەمیشیان بیرەوەرییەكانی پەری دوختی سپیهری خوشكی سوهرابە لەسەر ژیانی سوهراب و





نەوزاد محەمەد كردوویەتی بەكوردی. لەرۆژنامەو گۆڤارەكانیشدا جاروبار شیعری سوهراب و نوسینم لەسەر سوهراب بەرچاو كەوتووە. لەم رۆژانەشدا لەڕێی ئازیزێكەوە كتێبی (هەنوكە لەسەفەردام)م دەستكەوت كە نامە و بیرەوەرییەكانی سوهرابی تێدایە و پێشڕەو حوسێن و سۆران عەبدوڵا وەریانگێڕاوەو بەهەوڵی سامی هادی و لەلایەن بنكەی ئەدەبی و روناكبیری گەلاوێژەوە و لەساڵی ٢٠٠٣دا چاپكراوە. بەداخەوە من پێشتر ئەم كتێبەم نەبینی بوو. سەرەتا پێم سەیر بوو كە دوای خوێندنەوەی ئەم بیرەوەری و نامانەی سوهراب، بۆچی كەوتمەوە ناو بیرەوەرییەكانی منداڵیم و بۆ ئەو كاتانە گەڕامەوە كە هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییدا بووم؟ یەكێك لەو مامۆستایانەی خۆمم بیركەوتەوە كە زۆرم خۆش دەویست و بەمرۆڤێكی زۆر گەورەم دەزانی. ئەو كاتانەم بیركەوتەوە كە تیایاندا بە تاسەیەكی زۆرەوە خۆزگەم دەخواست بزانم ئەو مامۆستایەم لەماڵەوە چۆن دەژی؟ چۆن دەخەوێت و چۆن لەخەو هەڵ دەستێت و چۆن نان دەخوات و چۆن ڕیشی دەتاشێت و چۆن لەگەڵ منداڵەكانیدا هەڵسوكەوت دەكات و جلوبەرگی ماڵەوەی چۆنە و چۆن و چۆن و چۆن...

سەرەتا ئەم شتانەم پێ سەیر بوون، بەڵام لەدواییدا تێ گەیشتم كە من هەمان ئەو خۆزگانەم بەرامبەر بە سوهرابیش



هەبووە. وەکچۆن حەزم کردووە مامۆستاکەم لەدەرەوەی قوتابخانە ببینم، حەزیشم کردووە سوهراب لەدەرەوەی شیعرەکانی ببینم. وەکچۆن پێم خۆش بووە ئەو دیوەی مامۆستاکەم بناسم کە قوتابخانە نەیدەتوانی پێم بناسێنێت، هەر ئاوها حەزیشم کردووە، ئەو دیوەی سوهراب بناسم کە شیعرەکانی نەیان توانیووە پێم بناسێنن. بێگومان خۆم هەرگیز نەمتوانی مامۆستاکەم بەو جۆرە ببینم کە خۆزگەم پیٚ دەخواست و کەسیش نەیتوانی لەو ڕووەوە یارمەتیم بدات. وەڵێ ئەم کتێبە یارمەتییەکی زۆری دام کە سوهراب بەو جۆرە ببینم وا خۆزگەم پیٚ دەخواست. ئەم کتێبە دەتوانێت ئەو دیوەی سوهرابمان پیشان بدات کە کەوتۆتە پشتی شیعرەکانییەوە.

من دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە قوڵتر تێگەیشتم سوهراب مرۆڤێکی چەند تایبەت و چەند جیاواز بووە لە مرۆڤەکانی دی! ژیانێکی چەند سادە و خاکی و جوانی هەبووە و چەند دڵسۆز بووە بۆ قەناعەتەکانی خۆی!

باشتر لەوە تێگەیشتم کە سوهراب چەند قوڵ چۆتە ناو شتەکانەوەو خاوەنی چ ڕۆشنبیرییەکی تایبەت و چ جیهانبینییەکی جوان بووە! چۆن و بە چ عەشقێکەوە وڵاتانی وەکو هیند و ژاپۆن و ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا گەڕاوە و لەناو ئەو وڵاتانەشدا تا چ ئاستێك خەمی ناسینی کلتوری





ئەوانی هەبووە و بە چ پەرۆشییەکەوە بەدوای بینینی کارە هونەرییەکانیاندا گەڕاوە! چاکتر تێگەیشتم سوهراب تا چ ڕادەیەك شەیدای مانگەشەو و گوڵاڵە سوورە و بیابان و دەشت و نشێو و تەپۆڵکە و دەنگی باڵندە و بوونەوەرەکانی دیکە بووە و چۆن بیری لە دیواری کاگڵی و ڕێگاوبانەکان کردۆتەوە! ئەم کتێبە، جگە لەوەی کۆمەڵێکی زۆر زانیاریی گرنگ و پڕ بایەخی دامیٚ، چێژێکی زۆریشی پیٚ بەخشیم. لەزۆر بڕگە و دەستەواژەی نێو ئەم کتێبەدا هەستم دەکرد دیوێکی دیکەی شیعرەکانی سوهراب دەخوێنمەوە. هەستم دەکرد لەناو جۆرێکی دی لە وێنە شیعرییەکانییدا دەژیم. بەشێوەیەکی گشتییش هەستم دەکرد دەقێکی تێکەڵە لەشیعر و چیرۆك دەخوێنمەوە کە هاتووە بەسەرهاتی ژیانیی و روحیی بونەوەرێکی ناوازەم بۆ بگێڕێتەوە. بەسەرهاتی بوونەوەرێك کە ناوی سوهرابە و لەگەڵ بوونەوەرەکانی دیکەی دنیادا جیاوازیی ئاشکرای هەیە. ئەم بوونەوەرە تەواوی ژیانی خۆی لەگەڕان بەدوای مەعریفە و جوانییدا چڕ دەکاتەوە و جگە لەم دوو هێزە هیچ هێزێکی دی توانای سەرسامکردنی ئەوی نییە. لەتەواوی ئەم کتێبەدا بۆ یەك چرکەساتیش هەست ناکەیت ئەم بونەوەرە خەیاڵی لای پارە و سامان و پلەو پایە و ناوبانگ و خۆنمایشکردن بێت. بەڕۆژ وێنە دەکێشێت و لەسوریی گوڵاڵە



سوره ڕادەمێنێت و گوێ بۆ دەنگی باڵندە و گیانداران ڕادەدێرێت و بەشەویش دەخوێنێتەوە و لەئەستێرە و مانگ و جوانییەکانی شەو ورد دەبێتەوە و چێژیان لێ وەردەگرێت. لەسەفەرەکانیشیدا بۆ وڵاتانی دنیا، خەمی هەرە گەورەی بینینی کارە هونەرییەکانی ئەو وڵاتانە و ناسینی کلتوری ئەو وڵاتانەیە، ئەوەتا لە نامەیەکدا، کە لەتۆکیۆوە بۆ هاوڕێیەکی ناردووە بەناوی (ناسر)، دەڵێت: ((بەڕای من کارێك نییە لە تەماشاکردنی مۆزەخانە بێمانا تر، سەرەڕای ئەمەش مۆزەخانەکانی ئێرەم بینی. تەنها بۆ ئەوەش چووم بۆ ئەو مۆزەخانانە، کە کاری چەند نیگارکێشێکی دێرینی ئەوان و هەروەها کاری نیگارکێشە چینییەکان ببینم- ل ١٠٢)). ((لێرە بەئاسانی ناتوانی کاری نیگارکێشە کۆنەکان ببینیت، چونکە پێویستە بۆ هەر کام لەو نیگارانە لەپەرستگەیەکدا یاخود لە کۆلکسیۆنێرێکدا بگەڕێیت- ل١٠٩)). لەنامەیەکی دیکەشدا کە دیسان لە تۆکیۆوە بۆ ئەو ناسر ناوەی ناردووە، دەڵێت: ((ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان پارەیەکی زیاتر لەپێوانەی یاسای نیگارکێشانت هاتە دەست، بەڵکو کتێبێك لە (شیعرەکانی تاگور) ئەوەی کە (Gide) وەریگێڕاوە، بۆم بکڕیت و بۆم بنێریت، چونکە لێرە و لەئێران نەمانتوانی پەیای بکەین- ل١١٠)). ئاخۆ ئەوە چ عەشقێکە وا لەمرۆڤ دەکات دوو وڵات بەدوای کتێبێکدا بگەڕێت و دەستی نەکەوێت و واز





نەهێنێت؟ ئەوە چ شەیداییەکە وا لەمرۆڤ دەکات بۆ گەیشتن بە مەعریفە و جوانی زیاتر، چاوەڕوانی ڕۆژێك بکات کەتیایدا یەکێك لەهاوڕێکانی پارەیەکی زیاتری دەستبکەوێت و کتێبێکی بۆ بکڕێت و بۆی بنێرێت؟ ئەم بوونەوەرە تایبەت و جیاوازەی کە لەناو ئەم کتێبەدا ئاشنای دەبین لەناو ئەو هەموو تەنە سەیر و سەرنجڕاکێشانەی لەشارێکی وەکو پاریسدا هەن و چاوی غەریبەکان دەدزن و سەرمەستیان دەکەن، تاکە شتێك کە خەمی بۆ دەخوات و دەبێت بەحەسرەت لەدڵیدا و لەگێڕانەوەیدا بە پەری خوشکی دەڵێت بێ ئێوە ناخۆش، شەوێکی مانگە شەوە کە تا بەیان سەرنجی لێداوە. ئەوەتا لەنامەیەکدا دەنوسێت: ((پەری سڵاو...دوێنێ شەو مانگە شەو بوو ئێمە بەهیچ جۆرێ نەخەوتین، لەخیابان و کوچە و کۆڵانەکانی شاردا تا کاتژمێر سێی پاش نیوە شەو هەر لەدەرەوە بووین، دواتر ڕۆیشتین بەرەو دەوروبەری پاریس. من بووم و نادر پوور و سەعدی. ئەستێرەکانیش بوون. چ شەوێك چ هەوایەك بوو. بێ ئێوە ناخۆش. تا کاتژمێر ٧/٥ ی بەیانی لەسەر درەختەکان دانیشتین و دواتر گەڕاینەوە بۆ ماڵ- ل١٠٧)). ئەم بوونەوەرە چەند سەیرە کە دوای ناوی هاوڕێکانی دەڵێت ((ئەستێرەکانیش بوون)) تۆ هەستدەکەیت ڕێك باسی چەند هاوڕێیەکی دیکەی دەکات، ئەم باسکردنە هەرگیز لەباسکردنی چەند تەنێکی بێگیان



ناچێت. ئەدی ئەگەر ئەو بەو جۆرە لەشتەکان نەڕوانێت و لای ئەو هەموو شتەکان خاوەنی زیاتر لە حەقیقەتێك نەبن، چۆن دەتوانێت بەو ڕادەیە عاشقیان بێت و بەجۆرێك ئولفەتیان پێوەبگرێت کە ئامادە بێت شەو تا بەیانی لەخۆشی ئەوان نەخەوێت؟! ئاخر نابێت لەبیرمان بچێت کەدایك و باوك هەن هەندێجار ناتوانن شەو تا بەیانی بەدیار منداڵێکی نەخۆشی خۆیانەوە دابنیشن. ئاخۆ ئەمە مافی ئەوەمان ناداتێ بڵێین سوهراب مانگ و ئەستێرەکانی تا ڕادەی خۆشویستنی باوکێك یان دایکێك بۆ منداڵەکانی، خۆشویستووە؟! یان ڕاستتر بەمنداڵی خۆی زانیوون؟! سوهراب بە ڕادەیەك تێکەڵی سروشت دەبێت تۆ هەرگیز هەست ناکەیت ئەوەی کە باسی دەکات دارێك، یان درەختێك، یان گوڵێکی بێگیانە تەنها دەتوانێت جوانی خۆی نمایش بکات. هەست ناکەیت باسی تەنێکت بۆ دەکات کە نە زمانی هەیە پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤ بگرێت و نەدەنگێکی، بۆ نمونە، وەك دەنگی باڵندەی هەیە لەڕێگایەوە بچێتە نێو ڕوحی مرۆڤەوە، تۆ هەمیشە هەست دەکەیت ئەو باسی بونەوەرگەلێکت بۆ دەکات، کە وێڕای نمایشکردنی جوانیی، بۆ پەیوەندیکردن بەمرۆڤەوە شێوازی تایبەت بەخۆشیان هەیە. ئەوەتا هەست دەکات کە درەختەکانیش دەزانن ئەو ڕێبوارێکی بێگانەیە– ل١١٠.





***

سوهراب نەك توانیویەتی زۆرترین چێژ و جوانیی لە دار و درەخت و گوڵ و ئاو و ئەستێرە و مانگ و بیابان و گرد و تەپۆڵکە و نشێوەکان وەربگرێت و ((عەشقێکی گەورەی بۆ تەماشا لە دڵدا بێت– ل١٢))، بگرە ڕەخنەی گەورەی لە بەشێك لە خەڵك ئەوە بووە کە نەیانزانیووە تەماشا بکەن و ڕوحی خۆیان بەتەماشا تێر و پاراو بکەن. ڕەخنەی گەورەی لە بەشێك لە خەڵك ئەوە بووە: (( کە خراپ گۆش کراون– ل ٧٦)) کە ((بەجۆرێك لە تەماشاکردنی شتی چەقبەستوو و نەگۆڕ ڕاهاتوون– ل٧٦))، ئەگینا: ((هەردەم جۆرێك لە بوار لە ئارادایە بۆ دیتن و سەرنجدان و پێگەیشتن– ل ٧٦)).

سوهراب ڕەخنەی لەوەش هەبووە کە خەڵك بەخێرایی بەتەنیشتی دیمەنی گوڵەکاندا ڕەت دەبن و دەچن لەناو شیعردا بۆ گوڵ دەگەڕێن. دەشێت ئەمەش وا لێکبدرێتەوە کە سوهراب بڕوای وابووە مرۆڤێك نەتوانێت چێژ لەجوانییەکانی سروشت خۆی وەربگرێت، ناشتوانێت لەشیعردا چێژیان لێ وەربگرێت. ئەوەی وادەکات بتوانین جوانییەکان لەشیعردا هەست پێ بکەین، ڕاوەستان و ڕامانی قووڵمانە بەدیار خودی جوانییەکانەوە لەناو



سروشتدا. گەیشتن بە جوانییەکان لەناو شیعردا، بەتێپەڕین بەناو جوانیەکان لە سروشتدا، بەدەست دێت.

***

سوهراب لەگەڵ ئەوەشدا کە وتویەتی لەهەر کوێ بم ئاسمان هی منە و باکم بەوە نییە قارچکەکانی غوربەت بتەقێن، لەگەڵ ئەوەشدا کە تا ڕادەیەك مرۆڤێکی گەردوونیی بووە و وتویەتی من هیچ شوێنێك بە شوێنی خۆم نازانم، کەچی دواجار غەریبیی زۆری بۆ هێناوە و ڕوحە ناسکەکەی ئازار داوە و نیگەرانی کردووە. لەمبارەیەوە و لە نامەیەکیدا کە لەتۆکیۆوە بۆ هاوڕێیەکی خۆی نوسیووە، دەڵێت: ((سەرەنجام پەییم بەوە بردووە کە نەژاپۆن جێگەی منە و نە هیچ سەر زەمینێکی بێگانەی دیکە.

بەدەست خۆم نییە ناتوانم خوو بەدەر و دیوارە نا ئاشناکانەوە بگرم. کاتێك بەکوچە و شەقامەکاندا تێ دەپەڕم، جگە لەخەڵکەکەش، تەنانەت وادەزانم کە درەختەکانیش دەزانن ڕێبوارێکی بێگانەم- ل١١٠)).

***

لەڕێگای گێڕانەوەی هەندێك بەسەرهاتی منداڵیی خۆیەوە، سوهراب ڕەخنەی قووڵ لەکۆمەڵگای ئێرانیی دەگرێت و پێمان دەڵێت کەچۆن لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا ئایین بەسەختیی و





لەناوەختدا دەچێتە نێو ژیانی منداڵەکانەوە و ناچاری نوێژکردن و چوونە مزگەوتیان دەکات و دەرفەتی ئەوەیان ناداتێ کاتی خوداناسییان بگات و بۆ خۆیان ڕێگەکان ببینن و بە بڕوای خۆیان ڕێگەیەك هەڵبژێرن. ئەوەتا لەمبارەیەوە دەڵێت:

((من ساڵانێکی زۆر نوێژم کردووە، گەورەکان نوێژیان دەکرد، منیش دەبوو بیکەم. لەقوتابخانە بۆ نوێژکردن دەیانبردینە مزگەوت. ڕۆژێك دەرگای مزگەوت داخرابوو، بەقاڵ-ی سەری کۆڵانەکەمان وتی: "لەسەربانی مزگەوتەکە نوێژ بکەن، بۆئەوەی چەند مەترێك لەخودا نزیك ببنەوە"- ل١٢)).

لەشوێنێکی دیکەشدا دەڵێت: ((ئایین گاڵتەیەکی قورس بوو کە ژیان لەگەڵ من کردی و من چەندین ساڵ بەئاییندارى مامەوە بەبێ ئەوەی خودایەکم هەبێ- ل١٣)).

هەر لەڕێی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی منداڵیی خۆیەوە، ڕەخنەی قوڵ لەسیستمی پەروەردەی وڵاتەکەیشی دەگرێت، کەچۆن مامۆستاکان حەز و ئارەزووی منداڵەکان دەکوژن و کارێك دەکەن قوتابییە باشەکانیش ڕقیان لەقوتابخانە بێت و بەدرۆ خۆیان نەخۆش بخەن تا نەچنە قوتابخانە! چۆن کارێك دەکەن قوتابییەکان کۆلارەیان لە کتێبەکانی قوتابخانە خۆشتر بوێت و دەنگی سیسرکیان لە پەندەکانی مامۆستا پێ خۆشتر بێت! لەمبارەیەوە دەڵێت: ((لەپۆلی یەکەمی سەرەتاییدا لەبیرمە



وێنەم دەکێشا، مامۆستا بەدار هەنارەکەی لێیدام و وتی: "هەموو دەرسەکانت باشن، تاکە عەیبی تۆ ئەوەیە وێنە دەکێشی". ئەوە یەکەم پاداشت بوو کە بۆ وێنەکێشان وەرم گرت- ل١٣)). بێگومان ئەمەش مەرگەساتی کۆمەڵگای ئێران نییە بەتەنها. زۆرینەی ئەم کۆمەڵگایانەی خۆمان، ئەگەر لەدۆخێکی خراپتردا نەبن، لەدۆخێکی باشتردا نین. هەزاران هەزار خەڵکی ئەم کۆمەڵگایانە بە ناوی خۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ پاشەڕۆژیانەوە، لە خەونەکانی خۆیان دوورخراونەتەوە، غادە ئەلسەمان لە نوسێکدا لەو بارەیەوە دەڵێت:

((خۆشویستن گوڵە، بەڵام ئەگەر لە جێی خۆیدا بەکار نەهێنرێت دەبێت بە خەنجەر...خۆشویستن ئاگرە، ڕوناکییش دەدات و دەشسوتێنێت، چەندین دایك و باوك، بەو خەیاڵەوە کە ڕێی پاشەڕۆژیان بۆ ڕوناك دەکەنەوە، منداڵەکانی خۆیان سوتاند...گەنجێك کە خۆی هیوایەتی نواندی شانۆیی و کاری هونەریی بوو، لەلایەن کەسوکارییەوە ناچار کرا بچێتە کۆلێژی پزیشکی، چونکە خەڵك کورسی پزیشکی بە هونەر ناگۆڕنەوە، هونەر بەلای ئەوانەوە وەکو قومارکردن ترسناکە، ئەو گەنجە لە ساڵی یەکەمدا دەرنەچوو، خۆی کوشت...بێگومان ئەو گەنجە خۆی نەکوشتووە، بەڵکو کەسوکارەکەی بەناوی خۆشویستنەوە





کوشتوویانە)). بڕوانە: غادة السمان، غربة تحت الصفر، الطبعة الاولى، (بيروت: ١٩٨٦) ص ١٦٨-١٧١

چ غادە و چ سوهرابیش دەیانەوێت لە ڕێی گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانەوە، دەست بخەنە سەر کێشەیەکی گەورەی بەشێك لە کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان، کە ئەویش کێشەی دەستبردنە بۆ حەز و ئارەزووە قوڵەکانی مرۆڤ، کێشەی دەستکاریکردنی چارەنوسی مرۆڤەکان بە ناوی خۆشەویستی و دڵسۆزییەوە، چ غادە و چ سوهرابیش دەیانەوێت پێمان بڵێن ئەم کۆمەڵگایانەی ئێمە ناتوانن لەوە تێبگەن کە: ((چێشتلێنەرێکی باش لە پزیشکێکی خراپ و کرێکارێکی دڵسۆز لە فەیلەسوفێکی ساختە و جوتیارێکی ڕەسەن لە پرۆفیسۆرێکی دەجاڵ، باشترن))...غادة السمان، غربة تحت الصفر، الطبعة الاولى، (بيروت: ١٩٨٦) ص ١٦٨-١٧١

***

لە ڕاستییدا ئەم کتێبەی سوهراب، قسەی زۆر هەڵ دەگرێت، ئەگەر خۆمان بدەینە دەستی تا شوێنێکی زۆر دوور دەمانبات، باشترین کار ئەوەیە لە بری بەردەوامبوون لەسەر ئەم قسە و باسانە بچین کتێبەکە بخوێنینەوە، ئامانجی منیش لەم خوێندنەوەیە، زیاتر ئەوەیە ئیشتیهای تۆی خوێنەر بۆ خوێندنەوەی کتێبەکە بکەمەوە، چونکە پێم وایە ئەو کتێبە



لەگەڵ ئەوەی –بە داخەوە چاپێکی پەرپووت و خراپی هەیە– یەکێکە لەو کتێبە جوان و ناوازانەی بە ڕاستی شایانی خوێندنەوە و لەسەر وەستانی راستەقینەیە.

من لە دڵەوە دەستخۆشی و پیرۆزبایی لە وەرگێڕە ئازیزەکانی ئەم کتێبە دەکەم و هیوای بەردەوامی و کاری گەورەتریان بۆ دەخوازم...هەروەها دەستخۆشی لە هەموو ئەو ئازیزانە دەکەم کە لە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەدا ڕۆڵیان هەبووە...خۆزگە چاپی دووەمی ئەم کتێبە بە شێوەکی جوان و شایستە دەکرایەوە و دەرفەتی بینین و خوێندنەوەی بۆ زۆرترین خوێنەری ئێمە دەڕەخسێنرا.





## دوو نمونه له شیعری سوهراب

**وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی**





## دەنگی پێی ئاو

خەڵکی کاشانم
ڕۆژگارم خراپ نییە.
لەتێ نان شک ئەبەم، تۆزێک هۆش،
هێندەی سەرە دەرزییەک زەوق.
دایکێکم هەیە، نیانتر لە گەڵای درەخت
هاوڕێیانێ، باشترن لە ئاوی ڕەوان.

خوایەکیش لەم نزیکانە:
لە نێو ئەم شەوبۆیانە.
کن ئەو کاژە بەرزە.



بەسەر هۆشی ئاوەوە،

بەسەر قانوونی گیاوە.

من موسوڵمانم

قیبلەم گوڵەباخێکە

بەرماڵم کانییە، بەردەمۆرم ڕووناکییە.

دەشت فەرشی نوێژمە.

من لەگەڵ ترپەی پەنجەرەکانا دەسنوێژ ئەگرم.

لەنوێژما مانگ ئەڕوا، شەبەنگ ئەڕوا.

لەودیو نوێژمەوە بەرد دیارە:

تەواوی گەردەکانی نوێژم بەرجەستەن.

من کاتێ نوێژ ئەکەم

کە "با" لە منارەی دار سەرووەوە بانگی دابێ.

من دوای (تەکبیرە تولئەحرام)[1] ی گژوگیا نوێژ ئەکەم.

دوای (قەد قامەت)[2] ی شەپۆلەکان.

کەعبەی من لە قەراغ ئاوە.

کەعبەی من لەژێر ئەکاکیاکاندایە.[3]





کەعبەی من وەکو نەسیم باخ بە باخ و شار بە شار ئەڕوا.

(حەجەرولئەسوەد) ی من ڕۆشنایی باخچەیە.

خەڵکی کاشانم

پیشەم نیگارکێشانە.

جارجار قەفەسێ لە ڕەنگ دروست ئەکەم، بەئێوەی ئەفرۆشم

تا بە ئاوازی ئەو گوڵاڵە سوورانەی کە تیایدا بەندن

دڵی تەنیاییتان تازە بێتەوە.

چ خەیاڵێکە، چ خەیاڵێ،

ئەزانم تابلۆکەم بێ گیانە.

چاک ئەزانم، حەوزی نیگارەکەم بێ ماسییە.

خەڵکی کاشانم

ئەشێ ڕەچەڵەکم بچێتەوە

سەر گیایەک لە هند

سەر گڵێنەیەکی خاکی (سیالک)[4]

ئەشێ ڕەچەڵەکم بچێتەوە



سەر ژنێکی سۆزانی  شاری بوخارا .

باوکم لەودیو دووجار هاتنی پەڕەسێلکەکانەوە،
لەودیو دوو بەفرەوە،
باوکم لەودیو دوو خەوتنەوە لە هەیوان
لەودیو زەمەنەکانەوە مردووە.

کە باوکم مرد، ئاسمان شین بوو
دایکم بێئاگا لەخەو ڕاپەڕی، خوشکم جوان بوو
کە باوکم مرد، پاسەوانەکان هەموو شاعیر بوون.
کابرای میوەفرۆش لـێی پرسیم: چەند مەن[٥] کاڵەکت ئەوێ
منیش لێم پرسی:
ئیزرەمی [٦] دڵخۆشی بەچەند؟

باوکم نیگاری ئەکێشا
سازی دروست ئەکرد و هەم ئەیژەنی.
خەتیشی خۆش بوو.





باخەکەمان لەبەر سێبەری دانایيدا بوو.
باخەکەمان شوێنی پێکەوە گرێدانی هەست و گیا بوو.
باخەکەمان ژوانگەی نیگا و قەفەس و ئاوێنە بوو.
باخەکەمان ئەشێ کەوانەی بازنەی سەوزی بەختەوەری بووبێ.

ئەوسا  لەخەودا میوەی کاڵی خودام ئەجوو.
بەبێ فەلسەفە ئاوم ئەخواردەوە.
بەبێ زانست تووم ئەچنیەوە.
تا هەنارێک شەقی ئەبرد،
دەست ئەبووە فوارەی ئارەزوو.
تا کلاوکوڕەیەک ئەیخوێند،
سینە لە تامەزۆریی بیستنا ئەسووتا.
جار ناجارێکیش تەنیایی
دەموچاوی بە پەنجەرەوەکەوە ئەنا.
شەوق ئەهات و دەستی ئەکردە ملی هەست.
خەیاڵ وازیی ئەکرد.
ژیان شتێ بوو



وەک ڕێژنەبارانی جەژنێ، چنارێکی پڕ ڕیشۆڵە.
ئەوسا ژیان ڕیزێ ڕووناکی و بووکەشووشە بوو.
باخەڵێ ئازادی بوو.
ئەوسا ژیان،
حەوزێ بوو پڕ لە مۆسیقا.

مناڵەکە هێدی هێدی
لە کۆلانی پوشکەبەقونەکان دوورکەوتەوە.
باروبنەی خۆم پێچایەوە، لەشاری خەیاڵە خۆشەکان
چوومە دەرێ.
دڵیشم پڕ لە غوربەتی پوشکەبەقونەکان.

من چووم بۆ دەعوەتی دونیا:
بۆ دەشتی غەم،
بۆ باخی عیرفان،
بۆ هەیوانی چراخانی زانست چووم.
بەسەر پلیکانەی ئایندا سەرکەوتم،
تا ئەوپەڕی کوچەی گومان،





تا هەوای فێنکی قانعبوون،
تا شەوی تەڕی مەحەببەت چووم.
من بۆ دیداری کەسێ تا ئەوپەڕی عیشق ڕۆیشتم.
ڕۆیشتم، ڕۆیشتم ..هەتا ئافرەت
تا چرای لەززەت
تا کپبوونی ئارەزوو
تا دەنگی باڵەفڕێی تەنیایی.

گەلێ شتم دی لە سەر زەوی:
مناڵێکم دی بۆنی مانگی ئەکرد.
قەفەسێکی بێدەرگام دی تیایدا، ڕووناکی باڵی لێک ئەدا.
پەیژەیەک کە عیشق پیایدا بۆ سەربانی ئاسمان ئەچوو.
ژنێکم بینی لە دەسکەوانا نووری ئەکوتا.
نیوەڕۆ لەسەر سفرەکەیان نان هەبوو، سەوزە هەبوو،
قاپی پڕ لە شەونم هەبوو، جامی داخی مەحەببەت هەبوو.

من گەدایەکم دی
ئەم دەرگا و دەرگا ئەگەڕا، سواڵی ئاوازی کلاوکوڕەی ئەکرد.



کەناسێکم دی سوجدەی بۆ توێکڵی کاڵەکێ ئەبرد.

بەرخێکم بینی کۆلارەی ئەخوارد.
ولاخێکم دی لە وێنجە ئەگەیی.
لە لەوەڕگای (نەسیحەت) دا گایەکم دی تێر.
شاعیرێکم دی کە گوڵە سەوسەنی بانگ ئەکرد پێی ئەوت:
جەنابتان.

من کتێبێکم دی، وشەکانی لە جنسی بلوور.
کاغەزێکم دی، لە جنسی بەهار.
مۆزەخانەیەک دوور لەسەوزایی،
مزگەوتێ دوور لەئاو.

لای سەرینی فەقێیەکی بێهیواوە، گۆزەیەکم دی
سەرشار لەپرسیار.
هێسترێکم دی بارەکەی (ئینشا)،
حوشترێکم دی باری سەبەتەی بەتاڵی پەندی پێشینان.
عارفێکم دی باری (تەنەناها یاهو).





من قیتارێکم دی ڕووناکیی ئەبرد.
قیتارێکم دی فیقهی ئەبرد و چەند قورس ئەڕۆیی.
قیتارێکم دی سیاسەتی ئەبرد و (چەند بەتاڵ ئەڕۆیی).
قیتارێکم دی تۆوی نیلۆفەڕ و ئاوازی کەناری ئەبرد.
فرۆکەیەکیش بە بەرزیی هەزاران پێ،
لە پەنجەرەکەیەوە زەوی دیار بوو:
پۆپنەی پەپووسلێمانکە
خاڵەکانی باڵی پەپوولە
وێنەی بۆقێ لەحەوزا
پەڕینەوەی مێش لەکووچەی تەنیایی.
ئارەزووی ئاشکرای چۆلەکەیەک،
کاتێ لە چنارێکەوە ئەنیشێتە سەر زەوی.
باڵقبوونی خۆر و
ئامبازبوونی جوانی بووکەشووشە و بەیان.
ئەو پلیکانانەی بۆ گوڵستانی شەهوەت ئەچوون.
ئەو پلیکانانەی بۆ ژێرزەمینی ئەلکهول ئەچوون.
ئەو پلیکانانەی بۆ قانونی بەدبوونی گوڵەباخ و
بۆ ئیدراکی ماتماتیکیانەی ژیان.



ئەو پلیكانانەی بۆ سەربانی  سرووش،
ئەو پلیكانانەی بۆ سەكۆی تەجەللا ئەچوون .

دایكم لەو خوارە
پیاڵەكانی لەیادی ڕووبارا ئەشت.
شارەكە دیاربوو:
ڕووانی ئەندازەیی چیمەنتۆ، ئاسن، بەرد.
ساپیتەی بێكۆتری سەدان پاس.
گوڵفرۆشێک گوڵەكانی هەڕاج ئەكرد.
لەنێوان دوو درەختی گوڵی یاسدا، شاعیرێک
پەتی جۆلانەی  هەڵئەخست.
كوڕێک بەردی ئەگرتە دیواری مەكتەب.
منالێ ناوكە قەیسی  بەسەر بەرماڵە بێڕەنگەكەی باوكیدا
تف ئەكردەوە.
بزنێكیش لە (خەزەر) ی نەخشەی جوگرافیا
ئاوی ئەخواردەوە.

تەنافێكی جل دیار بوو: مەمكبەندێكی بێئۆقرە.





تایەی عەرەبانەیەک بە حەسرەت  وەستانی ئەسپەكەوە،
ئەسپەكە بە حەسرەت خەوتنی عەرەبانچیەكەوە،
كابرای عەرەبانچیش بە حەسرەتی مەرگەوە.

عیشق دیاربوو، شەپۆل دیاربوو.
بەفر دیاربوو، دۆستی دیاربوو.
پەیڤ دیار بوو،
ئاو دیار بوو، وێنەی شتەكان لە ئاوا.
نسێی فێنكی خانەكان لە گەرمەی خوێندا.
دیوە تەڕەكەی ژیان.
خۆرهەڵاتی خەمی ناخی مرۆ.
وەرزی سەرگەردانی لەكۆڵانی ژنا.
بۆنی تەنیایی لەكۆڵانی وەرزا.

بەدەستی هاوینەوە باوەشێنێ دیاربوو.

سەفەری تۆو بۆ بەگوڵبوون.
سەفەری لاولاو لەم ماڵەوە بۆ ئەو ماڵێ.



سەفەری مانگ بۆ حەوز.
خرۆشانی گوڵی حەسرەت لە خاک.
ڕژانی مێوە لاوەکە لە دیوار.
بارینی شەونم بەسەر پردی خەودا.
بازی شادی بەسەر خەندەقی مەرگا.
گوزەری ڕووداو لەودیو قسەوە.

جەنگی ڕۆچنەیەک لەگەڵ ئەڵهای ڕووناکیا.
جەنگی پلەیەک لەگەڵ قاچی درێژی خۆرا.
جەنگی تەنیایی لەگەڵ ئاوازێکدا.
جەنگی جوانی هەرمێکان لەگەڵ بەتاڵیی زەمیلەیەکا.
جەنگی خوێناویی هەنارو ددان.
جەنگی نازییەکان لەگەڵ لاسکی گوڵی نازا.
جەنگی تووتی و ڕەوانبێژی لەگەڵ یەکا.
جەنگی تەوێڵ لەگەڵ ساردیی بەردەمۆرا.

شاڵاوی کاشی مزگەوت بۆ سوجدە.
شاڵاوی با بۆ میعراجی گڵۆپەکەفی سابوون.





شاڵاوی لەشکری پەپوولە بۆ بەرنامەی (قەلاچۆکردنی ئافات).
شاڵاوی پێڕی پووشکەبەقونە
بۆ ڕیزی کرێکارانی (بۆڕی ڕاکێشان).
شاڵاوی فەوجی ڕەشی قەڵەمی قامیش
بۆ پیتە قوڕقوشمیەکان.
شاڵاوی وشە بۆ شەویلگەی شاعیر.

فەتحی چاخێ بەدەستی شیعرێ.
فەتحی باخێ بەدەستی ڕێشۆڵەیێ.
فەتحی کۆڵانێ بەدەستی دوو سڵاو.
فەتحی شارێ بەدەستی سێ‌چوار ئەسپسواری دارین.
فەتحی جەژنێ بەدەستی دوو بووکەشووشە و تۆپێ.

کوشتنی شەقشەقەیەک لەسەر دۆشەکی پاشنیوەڕۆ.
کوشتنی حیکایەتێ لەسەر کۆڵانی خەو.
کوشتنی غەمێ بە ئەمری سروود.
کوشتنی تریفەی مانگ بە ئەمری نیۆن.
کوشتنی داربییەک بەدەستی (دەوڵەت).



کوشتنی شاعیرێکی پەژموردە بەدەستی گوڵی یەخ.

هەموو ڕووی زەوی دیار بوو:

نەزم[٧] لە کوچەی یۆناندا ئەڕۆیی .

کونەپەپوو لە (باخچەی هەڵواسراو)[٨] دا ئەیخوێند.

با لە ملەی خەیبەرەوە[٩]، تۆپەڵێ دڕکودالێ مێژووی بەرەو

خۆرهەڵات ڕاپێچ ئەکرد.

بەسەر دەریاچەی ئارامی (نگین)[١٠]دا، بەلەمێک گوڵی ئەبرد.

لە بەنارس(١١)، لە هەر سەرکۆڵانێ

چرایەکی ئەبەدی هەڵکرابوو.

خەڵکانم دی.

شارانم دی.

دەشتانم دی، کێوانم دی.

ئاوم دی، خاکم دی.

ڕووناکی و تاریکیم دی.

ڕووەکم لە ڕووناکیا دی، ڕووەکم لە تاریکیا دی.

گیانەوەرم لە ڕووناکیا دی، گیانەوەرم لە تاریکیا دی.

مرۆم لە ڕووناکیا دی، مرۆم لە تاریکیا دی.





خەڵکی کاشانم، وەلـێ

شاری من کاشان نییە.

شاری من ون بووە.

من بەدڵ و بە گیان، بە کوڵ و کۆ

خانوویەکم لەو پەڕی شەوا دروست کرد.

من لەم خانووەدا لە گومناویی شەونماویی گیاوە نزیکم.

من گوێم لەدەنگی هەناسەی باخچەیە،

لە دەنگی تاریکی، کاتێ لە گەڵایەکەوە ئەکەوێ.

لە دەنگی کۆکەی ڕووناکی لەودیو درەختەوە.

پژمەی ئاو لەهەر درزی بەردێکەوە.

تکە تکی پەڕەسێلکە لە ساپیتەی بەهار.

دەنگی سافی والابوون و

داخرانی پەنجەرەی تەنیایی.

دەنگی پاکی کاژفڕێدانی پیواری عیشق.

کەڵەکەبوونی زەوقی فڕین لەباڵدا.



درزتێکەوتنی خۆڕاگریی ڕۆح.
من دەنگی پێی ئارەزوو ئەبیستم.
دەنگی پێی قانوونی خوێن لە دەمارا.
لێدانی دڵی سەحەری چاڵی کۆترەکان.
ترپەی دڵی شەوی هەینی.
ڕژانی گوڵەمێخەک لە هزرا.
حیلەی پاکی حەقیقەت لە دوورەوە.
من دەنگی هەڵکردنی مادده ئەبیسم.
دەنگی کەوشی ئیمان لە کوچەی شەوقا.
خرمەی باران لەسەر پێڵووی تەڕی عیشق
لەسەر مۆسیقای غەمناکی پێگەیین
لەسەر گۆرانی باخی هەناران و
دەنگی وردوخاشبوونی شووشەی شادی لەشەودا.

شەق و پەق بوونی کاغەزی جوانی.

پڕبوون و بەتاڵیی جامی غوربەت لە "با".
من لەسەرەتای زەوییەوە نزیکم.





ترپەی گوڵەکان ئەگرم.
ئاشنام بەچارەنووسی تەڕی ئاو،
بەعادەتی سەوزی دەرخت.
ڕۆحی من بەئاراستەی تازەی شتەکانا ئەڕوا.
ڕۆحی من لاوە.
جاری وایە ڕۆحی من لە هەژمەتا کۆکە ئەیگرێ.
ڕۆحی من بێکارە:
دڵۆپەی باران، درزی خشتەکان ئەژمێرێ.
جاری وایە ڕۆحی من هێندەی بەردی سەرەڕێیەک ڕاستە.

من نەمدیوە دوو سنەوبەر دوژمنی یەک بن.
من نەمدیوە داربییەک سێبەری خۆی بەزەوی بفرۆشێ.
نارەوەن بەخۆڕایی لقی خۆی بە قەلەڕەش ئەبەخشێ.
لەهەرکوێ گەڵایەک هەیە، خرۆشان شکۆفە ئەکا.
بنچکی خەشخاشێ منی لە سێڵاوی بووندا شتووە.

وەکو باڵی مێروو قورسایی سەحەر ئەزانم.
وەکو گوڵدانێ گوێ لە مۆسیقای ڕووان ئەگرم.



وەکو زەمیلەی پڕ لە میوە هەر بە حەسرەت گەیشتنم.
وەکو مەیخانەیەک لە سنووری تەمەڵی دام
وەکو ساختومانێکی گوێ دەریا
نیگەرانی شەپۆلە بەرزە ئەبەدییەکانم.

تا دڵ حەزکا هەتاو، تا دڵ حەزکا یەکبوون،
تا دڵ حەزکا زۆربوون.
من دڵم بەسێوێک خۆشە.
بەبۆنکردنی بنچکێ بەیبوون.
من بە ئاوێنەیەک، بە پەیوەندییەکی پاک قایلم.
کە میزەڵانەکە تەقی، پێناکەنم.
گەر فەلسەفەیەک مانگ بکا بە دوولەتەوە پێناکەنم.
من دەنگی باڵی پۆڕ ئەناسمەوە.
ڕەنگەکانی سکی کەناسمە، جێ پێی بزنەکێوی.
باش ئەزانم ڕێواس لەکوێ ئەڕوێ.
کەی ڕیشۆڵە دێ، کەو کەی ئەخوێنێ، باز کەی ئەمرێ.
مانگ لەخەوی بیابانا چییە.
مەرگ لەلاسکی ئارەزوودا و





تووتڕکی لەززەت، لەژێردانی دوو هەمبازا.

ژیان نەریتێکی خۆشە
ژیان پەڕوباڵی هێندەی مەرگە.
بازدانی بەقەدەر عیشقە.
ژیان شتێ نییە لەسەر تاقی عادەت لەیادی من و تۆ بچێ.
ژیان حاڵ لێهاتنی دەستێکە کە ئەچنێتەوە.
ژیان نۆبەرەی هەنجیرە ڕەشەیە، لەدەمی داخی هاوینا.
ژیان بەرزایی درەختە لەچاوی مێرووەوە.
ژیان تەجروبەی شەمشەمەکوێرەیە لە تاریکیا.
ژیان هەستی غەریبیی مەلێکی کۆچەرییە.
ژیان شووتی قیتارێکە کە لەخەوی پردێکا پێچ ئەکاتەوە.
ژیان بینینی باخچەیەکە لە جامی داخراوی فڕۆکەیەکەوە.
هەواڵی چوونی مووشەکە بەرەو ئاسمان.
دەستدانە لە تەنیایی مانگ.

تێفکرینە لە بۆنکردنی گوڵ لە هەسارەیەکی ترا.
ژیان شوشتنی قاپێکە.



ژیان دۆزینەوەی دراوێکی (دەشاهی)یە لە جۆگەلەی شەقاما.
ژیان (ڕەگی دووجا) ی ئاوێنەیە.
ژیان گوڵی بە (توان) ی ئەبەدییەتە.
ژیان (لێکدان) ی زەوییە لە لێدانی دڵی ئێمەدا
ژیان (ئەندازە) ی سادە و یەکسانی هەناسەکانە.

لەهەرکوێ یەک بم
ئاسمان هی منە.
پەنجەرە، بیر، هەوا، عیشق، زەوی هی منە.
چ بایەخێکی هەیە گەر هەندێ جار
قارچکەکانی غوربەت بڕوێن؟

من نازانم
بۆچی ئەڵێن: ئەسپ حەیوانێکی نەجیبە، کۆتر جوانە.
بۆ کەس لە قەفەسی خۆیدا داڵ ڕاناگرێ؟
گوڵی وێنجە چیی لە گوڵاڵە سوورە کەمترە؟
ئەبێ چاوانمان بشۆین، بەجۆرێکی دی بڕوانین.
ئەبێ وشەکان بشۆین.




وشە ئەبێ خۆی "با"، وشە ئەبێ خۆی باران بێ.
ئەبێ چەترەکانمان تووڕدەین(١٢).
بەژێر بارانا ڕێ بکەین.
ئەبێ بیر و یادەوەریمان بدەینە بەر باران.
ئەبێ لەگەڵ تەواوی خەڵکی شارا بەژێر بارانا ڕێ بکەین.
ئەبێ لەبەر بارانا یارانمان ببینین.
ئەبێ لەبەر بارانا بەدووی عیشقا بگەڕێین.
ئەبێ لەبەر بارانا لەگەڵ ئافرەتا بخەوین.
ئەبی لەبەر بارانا یاری بکەین.
ئەبێ لەبەر بارانا، بدوێین، نیلۆفەر بڕوێنین.

ژیان تەڕبوونی پەیتا پەیتایە.
ژیان مەلەیە لە ئەستێرکی (هەنووکە) دا.

با جلەکانمان فڕێ بدەین[١٣]:
ئاوەکە هەنگاوێ دوورە.
تامی ڕۆشنایی بکەین.
شەوی لادێیەک بکێشین، خەوی ئاسکێ.



پەی بەگەرمی هێلانەی لەقلەقێ بەرین.
پێ بە قانوونی چیمەنا نەنێین.
لەنێو ڕەزان گرێی زەوق بکەینەوە.
کەمانگ  هەڵهات دەممان بکەینەوە.
نەشڵێین شەو شتێکی خراپە.
نەشڵێین گوڵئەستێرە لە دیتنی باخ بێئاگایە.
با سەبەتە بێنین و
ئەم هەموو سوورە، ئەم هەموو سەوزە هەڵگرینەوە.
بەیانیان نان و تۆڵەکە بخۆین.
لە پێچی هەر قسەیەکا نەونەمامێ بروێنین و
لەنێوان هەردوو حونجەیەکا تۆوی بێدەنگی بچێنین.
کتێبێ نەخوێنینەوە کە تیایدا "با" هەڵناکا.
کتێبێ کە تیایدا پێستی شەونم تەڕ نییە.
کتێبێ کە تیایدا خانەکان بێ مەودان.
نەشخوازین مێش لەسەر پەنجەی سروشت بفڕێ.
نەشخوازین پڵنگ لەدەرگای خەلیقەت بچێتە دەرێ.
ئەبێ بشزانین گەر کرم نەبوایە، ژیان شتێکی کەم ئەبوو.
ئەگەر کرمۆکەش نەبووایە قانوونی درەخت ئەشێوا.





ئەگەر مەرگیش نەبووایە،
دەستمان بەدووی شتێکا هەر ئەگەڕا.
بشزانین گەر ڕووناکی نەبووایە،
لۆژیکی زیندووی فڕین ئەگۆڕا.
بشزانین بەر لەمەرجان،
چۆڵەوانیەک لەئەندێشەی دەریاکانا هەبوو.
نەشپرسین لە کوێین.
بۆنی گوڵە پاتۆنیای تازەی نەخۆشخانە بکەین.

نەشپرسین فوارەی بەخت لەکوێیە.
نەشپرسین بۆچی دڵی حەقیقەت شینە.
نەشپرسین باوانی باوان چ نەسیمێ، چ شەوێکیان هەبووە.
لە ڕابردوودا فەزایەکی زیندوو نییە.
لە ڕابردوودا مەڵێک ناخوێنێ.
لە ڕابردوودا بایەک هەڵناکا.
لە ڕابردوودا پەنجەرەی سەوزی سنەوبەر داخراوە.
لە ڕابردوودا، گشت فڕفڕۆکەکان تۆزیان لێ نیشتووە.
لە ڕابردوودا، شەکەتیی مێژوو ڕاکشاوە.



له ڕابردوودا یادەوەریی شەپۆل سەدەفی ساردی بێدەنگی
بەسەر کەنارا ئەڕێژێ.

بچینە ڕۆخ دەریا.
تۆڕ هەڵدەینە ئاوەوە و
تەڕایی ئاو بگرین.
بەردەچەوێ لەسەر زەوی هەڵگرینەوە و
هەست بە قورسایی بوون بکەین.

گەر تامان لــێ هات قسە بە تریفەی مانگ نەڵێین.
(هەندێجار کە تام لێ هاتووە، بینیومە مانگ دێتە خوارێ.
دەست ئەگاتە سەقفی ئاسمان.
بینیومە ڕیشۆڵە خۆشتر ئەخوێنێ.
هەندێجار برینێ لەپێما بووە
کەندولەندی زەوی بەمن ناساندووە.
هەندێجار لەپێخەفی نەخۆشیدا،
قەوارەی گوڵم لابووە بە دوو هێندە
گەورەتر بووە چێوەی نارنج، تیشکی چرا.)




نەشترسین لە مەرگ!
(مەرگ کۆتایی کۆتر نێیە
مەرگ هەڵگێڕانەوەی زیکزیکەیەک نییە
مەرگ لە زەینی ئەکاکیادا دێت و ئەچێ.
مەرگ لە کەشوهەوای خۆشی ئەندێشەدا نیشتەجێیە.
مەرگ لەخودی شەوی دێدا سەبارەت بەربەیان ئەدوێ.
مەرگ لەگەڵ هێشووی ترێدا دێتە دەمەوە.
مەرگ لەگەڵ "بووکەسوورە" دا ئەخوێنێ.
مەرگ لەجوانی باڵی پەپوولە بەرپرسیارە.
مەرگ جاری وایە ڕێحانە ئەچنێ.
مەرگ جاری وایە ڤۆدگا ئەنۆشێ.
جاری واشە لەسێبەرا دانیشتووە و لەئێمە ئەڕوانێ.
هەمووش ئەزانین
سیەکانی لەززەت، پڕن لە ئۆکسجینی مەرگ)

دەرگا بەڕووی پەیڤی زیندووی چارەنووسا دانەخەین
کەلەودیو پەرژینەکانی دەنگەوە ئەیبیستین.



پەردە هەڵماڵین:
لێگەڕێین ئیحساس بای باڵی خۆی بدا
لێگەڕێین باڵقبوون لەژێر هەربنچکێکا پێی خۆش بوو
دەواری خۆی هەڵبدا
لێگەڕێین غەریزە یاری خۆی بکا
پێڵاو داکەنێ و بەدوای وەرزەکانا
لەم گوڵەوە بۆ ئەو گوڵ بازبدا
لێگەڕێین تەنیایی گۆرانی بچڕێ ،
شت بنووسێ،
بچێتە سەرجادە.
با سادەبین.
سادەبین چ لەبەردەم پەنجەرەی بانقێکا و
چ لەژێر درەختێکا.
کاری ئێمە پەیبردن نییە بە نهێنی گوڵەباخ.
ئەشێ کاری ئێمە ئەوەبێ
لە ئەفسوونی گوڵەباخدا مەلە بکەین.
لەودیو داناییەوە دەوار هەڵبدەین.
دەستمان لەنەشئەی گەڵایەکا بشۆین
ئینجا بچینە سەر خوان.
بەیانیان کاتێ خۆرهەڵدێ لەدایک بین.





هەژانەکانمان هەڵفڕێنین.
بەسەر ئیدراکی فەزا، ڕەنگ، دەنگ، پەنجەرە، گوڵدا
ئاونگ بپرژێنین.
ئاسمان لەنێوان دوو حونجەی "بوون"ا دانیشێنین.
سیەکان لە ئەبەدییەت پڕ و خاڵی کەین.
باری زانست لەکۆڵی پەرەسێلکە داگرین.
ناو بسەنینەوە لە هەور
لە چنار، لە مێشوولە، لە هاوین.
بەسەر پێی تەڕی بارانا بەرە و دوندی ئەڤین بچین.
دەرگا بەڕووی مرۆڤ و ڕووناکی و ڕووەک و مێرووودا بکەینەوە.
ئەشێ کاری ئێمە ئەوەبێ،
لەنێوان گوڵی نیلۆفەر و سەدەدا،
وەدووی ئاوازی حەقیقەت کەوین.

**کاشان، دێی چنار**
**هاوینی ١٩٦٤**



**پەراوێزەکان:**

(١) تەکبیرەتولئەحرام: وتنی (اللّٰه اکبر) بە بەرزی لەکاتی نوێژدا.

(٢) قەدقامەت: ئاماژەیە بۆ (قد قامت الصلاە).

(٣) ئەکاکیا: جۆرە درەختێکە هێشووە گوڵی سپی یا پەمەیی بۆنخۆش ئەگرێ.

(٤) سیالك: ناوچەیەکی دێرینی باشووری خۆرئاوای کاشانە (کاشانیش زادگای سوهرابە).

(٥) و (٦) مەن و سیر: دوو یەکەی کێشانەن ، من لێرەدا ( سیر ) ەکەم کردووە بە ئیزرەم کە کاتی خۆی لەناو کورددا یەکەیەکی کێشانە بووە.

(٧) نەزم: بە واتا نیزام، سیستم.

(٨) باخچەی هەڵواسراو: ئاماژەیە بۆ باخچە هەڵواسراوەکانی بابل.

(٩) ملەی خەیبەر: شوێنێکی مێژوویی بەناوبانگە، دەکەوێتە نێوان پاکستان (هیندستانی کۆن) و ئەفغانستان (ئێرانی کۆن) ەوە.

(١٠) نگین: پێدەچێ دەریاچەیەکی بچووك بێ لەناوچەی کەشمیر.

(١١) بەنارس: لە شارە پیرۆزەکانی هیندۆکانە کە لە کەنار ڕووباری گەنج دایە و ساڵانە ملیۆنەها هیندۆیی خۆیانی تیا ئەشۆن.

(١٢) لەئەسڵەکەدا بەمجۆرەیە: ئەبێ چەترەکانمان داخەین، بەڵام من (تووڕدەین)م پێ جوانتر بوو.

(١٣) لەئەسڵەکەدا: باجلەکانمان داکەنین.





# موســـــافیر

دەمەو خۆرنشین
لەنێو ئامادەگیی کەنەفتی شتەکانا
نیگای  کەسێکی چاوەڕوان، قەوارەی کاتی ئەبینی.
لەسەر مێزەکەش، ژاوەژاوی چەند میوەیەکی نۆبەرە
بەرەو لای نادیاری ئیدراکی مەرگ ئەچوو.
"باڵش لەسەر فەرشی حەسانەوە،




بۆنی باخچەکەی بەسەر داوێنی سافی ژیانا
پەخش ئەکردەوە.
زەینیش ڕووی ڕۆشنی گوڵی
وەک باوەشێن بەدەستەوە گرتبوو،
خۆی پێ باوەشێن ئەکرد.
موسافیر لەپاسەکە دابەزی:
"ئاسمانێکی چەند خاوێنە!"
درێژیی شەقامی غوربەت ئەوی برد.

خۆرنشین بوو،
دەنگی هۆشی گیاکان ئەهاتە گوێ.
موسافیرەکە هاتبوو،
لەسەر ئەسکەمیلێک لەقەراغ چیمەنەکە
دانیشتبوو:
"دڵم تەنگە،
دڵم زۆر تەنگە.
بەدرێژایی ڕێگاکە بیرم لەشتێ  ئەکردەوە،
ڕەنگی بنارەکانیش



هۆشیان لەسەرم ئەڕفاند.
خەتەکانی شەقامەکەش لەخەمی دەشتەکانا ون بوون.
ئەو دەربەندە سەیرانە!
ئەی ئەسپەکە، لەبیرتە،
سپی بوو
هەروەکو وشەیەکی پاک،
لە بێدەنگیی سەوزی چیمەنزارەکە ئەلەوەڕا.
پاشان غوربەتی ڕەنگینی لادێکانی سەرەڕێ.
ئینجا تونێلەکان.
دڵم تەنگە.
دڵم زۆر تەنگە.
هیچ شتێکیش،
نە ئەم دەقیقە بۆنخۆشانەی کە بەسەر لقی نارنجەکەوە
ئەکوژێنەوە
نە ئەم ڕاستبێژییەی حەرفێ،
کە وا لە بێدەنگیی نێوان
دوو گەڵای ئەم گوڵە شەوبۆیەدا،
نەو، هیچ شتێ من لەشاڵاوی خاڵیی دەوروبەر





قوتار ناکا،
پێشم وایە
ئەم ئاوازە کێشدارەی حوزن تا ئەبەد
هەر دێتە گوێ".

نیگای کابرای موسافیر کەوتە سەرمێز:
"ئای لەم سێوانە چەند جوانن!
ژیان نەشئەی تەنیاییە"
خانەخوێ پرسیی:
جوان یانی چی..؟
- جوان یانی دەربڕینی عاشقانەی شێوەکان
عیشقیش... بەتەنها عیشق
تۆ بەگەرمیی سێوێ ئاشنا ئەکا.
عیشقیش... بەتەنها عیشق
منی گەیاندە دەڤەری بەرینی حوزنی ژیان.
وای لێکردم بتوانم ببمە باڵندە.



- ئەی شەرابی سیحری غەمان..؟
-دەنگێکی سافی ئیکسیریت پێ ئەبەخشێ.

شەو داهات.
چرا ڕۆشن بوو.
چایان ئەخواردەوە.
- بۆچی دڵت تەنگە، ئەڵێی تەنیایت.
- چەندیش تەنیا!
- واهەست ئەکەم
تووشی ڕەگی نادیاری ڕەنگەکان بوویت.
- تووشبوون یانی..
- عاشق.
- ئینجا بزانە چەند تەنیایە
گەر ماسییەکی چکۆڵە، تووشی ئاوی
دەریایەکی بێ سنوور بێ
- چ خەیاڵێکی ناسک و خەمناکە!
- خەمیش خەندەی شاراوەی نیگای ڕووەکە.
خەمیش ئاماژەیەکی مەحفبووە





بۆ ڕەتکردنەوەی یەکبوونی شتەکان.
- خۆشی لە گیاکان کە عاشقی ڕووناکین
دەستی کراوەی ڕووناکیش وا لەسەر شانیان.
- نەو، بەیەک گەیشتن مەحاڵە،
هەمیشە مەودایەک هەیە.
گەرچی چەماوەی ئاو سەرینێکی باشە
بۆ خەوی دڵگیر و تەڕی نیلۆفەڕ،
هەمیشە مەودایەک هەیە.
ئەبێ تووش بین
دەنا نەغمەی سەرسامیی نێوان دوو قسەمان
لێ حەرام ئەبێ.
عیشقیش
سەفەرە بۆ ڕۆشنایی لەرینەوەی خەڵوەتی شتەکان.
عیشقیش
دەنگی مەوداکانە.
دەنگی ئەو مەودایانەی کە
- نوقمی نادیارن
-نەو،



دەنگی ئەو مەودایانەی کە وەک زیو پاکن
بە بیستنی هیچێکیش ڕەش دائەگەڕێن.
عاشق هەمیشە تەنیایە و
دەستی عاشق لەنێو دەستی ناسکی چرکەکاندایە.
ئەو و چرکەکان ئەچن بۆ ئەوبەری ڕۆژ.
ئەو و چرکەکان لەسەر نوور ئەخەون.
ئەو و چرکەکان باشترین کتێبی دونیا
بەئاو ئەبەخشن.
چاکیش ئەزانن
کە هەرگیز
هیچ ماسییەک ناتوانێ
هەزار و یەک گرێی ڕووبارەکە بکاتەوە.
نیوەشەوانیش، بە بەلەمی دێرینەی ئیشراق
ڕەوانەی ئاوی هیدایەت ئەبن و
تا تەجەللای سەرسامی سەوڵ لێ ئەدەن.
- هەوای قسەی تۆ
مرۆڤ بۆ کۆڵانی باخی حیکایەتەکان ئەبا
لەدەمارەکانی ئەم ئاوازەشدا





چ خوێنێکی تازەی غەمگین دێت و ئەچێ..!

حەوشەکە ڕووناک بوو
"با" ئەهات و
خوێنی شەویش لە بێدەنگیی ئەو دوو پیاوەدا
گوزەری ئەکرد.

"ژوورێکی چۆڵ و پاکە.
مەوداکانی چەند سادەن بۆ بیرکردنەوە..!
دڵم زۆر تەنگە..!
نیازیشم نییە بخەوم".

چووە لای پەنجەرەکەوە
لەسەر کورسیە قوماشە نەرمەکە دانیشت:
"هێشتاکە هەر لەسەفەردام.
وا هەست ئەکەم
لەئاوەکانی جیهاندا بەلەمێک هەیە و
منیش —موسافیری ئەو بەلەمە- هەزاران ساڵە



سروودی زیندووی دەریاوانە کۆنەکان
بەگوێی ڕۆچنەی وەرزەکاندا ئەدەمەوە و
بەرەو پێشەوە سەوڵ لێ ئەدەم.

سەفەر من بەرەو کوێ ڕاپێچ ئەکا..؟
لەکوێ ئاسەواری شوێن پێ، بە ناتەواوی ئەمێنێتەوە و
بە پەنجە نەرمەکانی حەسانەوە،
قەیتانی پێڵاوەکە ئەکرێتەوە..؟
مەنزڵ وا لە کوێ و ڕاخستنی فەرشێک و
بە ئاسوودەییەوە دانیشتن و
گوێگرتن لە دەنگی
شوشتنی قاپی ژێر بەلووعەیەکی نزیک؟

لەچ بەهارێکا
زۆر دەمێنیتەوە و
ڕووکاری ڕۆحیش پڕ ئەبێ لەگەڵای سەوز..؟

ئەبێ شەراب بنۆشین و





لە گەنجێتیی سێبەرێکا ڕێ بکەین
ئەوەندە و بەس.

لەکوێیە ئاقاری ژیان..؟
لەچ لایەکەوە ئەگەمە پەپووسڵێمانکەیەک؟
گوێ ڕادێرە، ئەم قسەیە لەتەواوی سەفەرەکەدا
بەردەوام پەنجەرەی خەوی داوە بەیەکدا.
بەدرێژایی ڕێ چ شتێ بە بناگوێتا ئەیخوێند..؟
باش تێفکرە
ناوکی پەنهانی ئەم ئاوازە پڕ نهێنییە لەکوێیە..؟
چ شتێکە پێڵووەکانت ئەگوشێ،
چ قورساییەکی گەرمی دڵڕفێنە..؟
سەفەرەکە درێژ نەبوو:
تێپەڕینی پەڕەسێلکە لەقەوارەی کاتی کەم ئەکردەوە.
لە گفتوگۆی نێوان "با" و لەوحەکانیشدا
ئاماژەکان بۆ سەرەتای هۆش ئەگەڕانەوە.
لەو ساتەدا کە لە بەرزایی هاوینەوە
ئەتڕوانیە "جاجرود"[١]ی خرۆشاو،



چی ڕووی دا،
وا ڕیشۆڵەکان خەوی سەوزی تۆیان دروێنە کرد؟
وەرزیش، وەرزی درەو بوو.
بە نیشتنەوەی ڕیشۆڵەیەک لەسەر لقی دارسەرووییەک
کتێبی وەرز هەڵدرایەوە،
دێڕی یەکەمیش ئەمە بوو:
ژیان، غەفڵەتی ڕەنگینی دەقیقەیەکی "حەوا"یە.

تەماشات ئەکرد:
زەینی "با" بە مابەینی چێڵ و چیمەندا ئەڕۆیی.

تەماشای یادگاریی شاتووی سەر پێستی وەرزت ئەکرد.
حزووری ڕەنگاڵەیەک لە وێنجەکانا
ڕووشانی ڕوخساری هەستی سارێژ ئەکرد.

بڕوانە، هەمیشە ڕووشانێک لەسەر ڕوخساری هەست هەیە.
هەمیشە شتێک، کە ئەڵێی هوشیاریی خەوە،
بە ئەسپایی هەنگاوی مەرگ لەدواوە پێمان ئەگا





دەست ئەخاتە سەرشانمان
ئێمەش وەک ژەهرێکی بەتام
لەپەنا ڕووداوەکانەوە
گەرمیی پەنجە بەورشەکانی ئەنۆشین.
"ڤینیسیا"ت لەیادە؟
سەر کەناڵە ئارامەکە؟
لەو دەمەقاڵێ ژەنگاویەی نێوان ئاو و زەویدا
کە زەمەن لەودیو ئاوێزەوە ئەبینرا
لەرینەوەی بەلەمەکە، زەینی تۆی لەراندەوە:
تەپوتۆزی عادەت هەمیشە وا لە سەر ڕێی ڕوانینا.
هەمیشە ئەبێ بەهەناسەی تازەوە ڕێ بکەین و
فوو بکەین
تا ڕوخساری زێڕینی مەرگ پاک پاک بێتەوە.

کوا بەردی "ڕونوس" ؟[٢]
من لە هاونشینیی درەختێکەوە دێم
کە دەستە ساکارەکانی غوربەت
ئاسەواری لەسەر توێکڵەکەی جێهێشتبوو:



"له دڵتەنگیدا دێرێکم بۆ یادگار نووسی"

شەرابم وێدەن
ئەبێ خێرا کەین:
من لەگەشتی ناو داستانێکەوە دێم و
تەواوی چیرۆکی "سوهراب و نوشدارو"م
وەک ئاو لەبەرە.

سەفەر منی بردە بەردەرگای باخی مناڵی و
وەستام.. تا
دڵم بسرەوێ،
دەنگی باڵەفرێم هاتەگوێ
کە دەرگاکەش کرایەوە
لەتاو شالاوی حەقیقەت
کەوتم بە ئەرزا.

هەمدیسان، لەژێر ئاسمانی "مەزامیر"دا [٣]
لەو سەفەرەدا کە لەگوێ ڕوباری "بابل"





هاتمەوە هۆش خۆم،
دەنگی عود نەدەهات
کە باش گوێم گرت، دەنگی گریان ئەهات
چەند عودێکی بێ ئۆقرەش
بە لقە تەڕەکانی داربیەکەوە دەلەنگینەوە.

لە ڕەوتی سەفەرا ڕاهیبە بێگەردە مەسیحیەکان
ئاماژەیان بۆ تابلۆی خامۆشی "ئیرمیای پێغەمبەر"[٤]
ئەکرد.
منیش بەدەنگێکی بەرز
"کتێبی جامیعە"[٥]م ئەخوێندەوە.
چەند جوتیارێکی لوبنانیش
لەژێر دار کونارێکی پیردا دانیشتبوون
لەزەینی خۆیاندا
بەروبوومی درەختەکانی خۆیان ئەژمارد.

لە قەراغ ڕێی سەفەرەوە
مناڵە کوێرە عێراقیەکان



ئەیانرِوانییە خەتی لەوحەکەی حامورابی.[٦]

لەرِەوتی سەفەرا
چاوم بە رِۆژنامەکانی جیهاندا ئەخشاند.

سەفەرەکە پرِ لە بزاوت بوو
هەموو ساپیتەکەشی
بەهۆی ژاوەژاوی سەنعەتەوە
رِەش داگەرِابوو
بۆنی رِۆنی لێ ئەهات.
لەسەر زەوی سەفەرەکەش
شووشەی بەتاڵی مەی و
درزەکانی غەریزە و سێبەرەکانی دەرفەت
لای یەکەوە کەوتبوون.
لەمیانی رِێی سەفەرا
لەخانەی سیلاوییەکانەوە
دەنگی کۆکە ئەهات.
ئافرەتە سۆزانیەکانیش لەئاسمانی شینی شارا



ئەیانرِوانییە درزی رِۆشنی فوارەکان.
مناڵانیش بەدوا فرِفرِۆکەکانا چووبوون،
کەناسەکانی شەقام گۆرانییان ئەوت
شاعیرە گەورەکانیش
نوێژیان بۆ گەڵا کۆچەرییەکان ئەکرد.
رِێی دووری سەفەریش، لەنێو ئادەمیزاد و ئاسندا
بەرەو گەوهەری پەنهانی ژیان ئەچوو،
بە غوربەتی تەرِی جۆگەیەک،
بریسکەی خامۆشی پوولەکەیەک،
ئاشنایی ئاوازێک،
بێ سنووریی رِەنگێک.. تێکەڵ ئەبوو.

سەفەر منی بۆ زەوییە ئیستیواییەکان برد.
ئەو دێرِەم باش لەبیرە
کە لەژێر سێبەری ئەو دار بانیانە سەوزە زەبەلاحانەدا
چووە کوێستانی زەینەوە:
دڵفراوان و تەنیا و سەرکز و سەخت بە.

من لە هاودەمیی هەتاوەوە دێم
کوانێ نسێ؟

وەلێ هێشتا پێ ، گێژی دەست لق و پۆپی بەهارە
بۆنی گوڵەوەچنیش لە دەستی "با"دێ
هەستی بەرکەوتنیش لەودیو تۆزی حاڵەتی نارنجەوە
لەهۆش خۆی چووە.
لەم کێشمەکێشە ڕەنگینەدا، کێ ئەزانێ
بەردی تەنیایی من لەکام خاڵی وەرزدایە.
هێشتا لێرەوار، مەودا بێشومارەکانی خۆی
ناناسێ.
هێشتا گەڵا
وا بەسەر پشتی یەکەمین پیتی "با"وە.
هێشتا مرۆ
شتێک بە ئاو ئەڵێ.
لە ویژدانی چیمەندا جۆگەی مشتومڕێک ئەڕوا و
بەسەر مەداری درەختەوە
زایەڵەی باڵی کۆتر،





ئامادەگیی ئاڵۆزی ڕەفتاری ئادەمیزادە.

ورتە ورتی دێ و
من تاقە گوێگری باکانی جیهانم.
ڕووبارەکانی جیهانیش
من فێری نهێنیی پاکی فەنا بوون ئەکەن،
بەتەنها من.
منیش ڕاڤەکاری چۆلەکەکانی دەربەندی "گەنگ" م و
لەقەراغ جادەی "سەرەنات"
گوارەی عیرفانی نیشانە "تبت" م
بۆ گوێی نارازاوەی کچانی "بنارس" لێک دایەوە.
ئەی سروودی سپێدەی "ڤیداکان"[٦]
چی قورسایی "تەروبری" یە،
بیدە بە کۆڵی منا، چون
گیرۆدەی گەرمیی گوفتارم.
ئێوەش
ئەی درەختانی زەیتونی فەلەستین
پیتوفەڕی سێبەری خۆتانم وێدەن،



بەم موسافیرە تەنیایەی کە لە گەشتی
دەوروبەری  شاخی "توور"[٧]ەوە دێت و
لەتاو گەرمای "تەکلیم"[٨] خرۆشاوە.

بەڵام ڕۆژێ دێ  تەکلیم نامێنێ و
شکۆی پەپوولەکانی پەرتیی هەست
شارێی هەوا
سپی ئەکا.

چیەها شیعریان بۆ ئەم حوزنە کێشدارە گوت!

وەلێ هێشتا کەسێک  ماوە
لەژێر درەختەکەدا وەستاوە.
وەلێ هێشتا ئەسپسوارێ وا لەودیو شوورای  شارەوە
کە قورسایی خەوی خۆشی فەتحی قادسیە[٩]
وا بەسەر شانی پێڵووی تەڕیەوە.
هێشتا حیلەی ئەسپە نەسرەوتەکانی مەغۆل
لەخەڵوەتی کێڵگەکانی وێنجەوە بەرز ئەبێتەوە.




هێشتا بازرگانە "یەزدی"یەکە، لە نزیک "جادەی ئەدویە"وە[١٠]
بەبۆنی داوودەرمانی هند لەهۆش خۆی ئەچێ.
هێشتا لەقەراغ "هامون"[١١]وە ئەبیستی:
- خراپە هەموو زەوی گرتۆتەوە
- هەزار ساڵ تێپەڕی
- دەنگی مەلەکردنێ نەهاتە گوێ و
وێنەی جەستەی کیژۆڵەیەک نەکەوتە ئاوەکەوە.

لەنیوەی ڕێما، لەسەر ڕۆخی "جومنا"[١٢]
دانیشتبووم
ئەمڕوانیە وێنەی "تاج محەل" لەئاوەکەدا:
بەردەوامیی مەرمەڕیانەی ساتە ئیکسیرییەکان و
بەرەو پێشوونی قەوارەی ژیان لەمەرگا.
بڕوانە، دوو باڵی گەورە
چۆن بەرەو کەناری ڕۆحی ئاوەکە لەسەفەردان.
پزیسکی سەیرن لەنزیک دەستەوە .
وەرە و دەیجوری ئیدراک بکە بە چراخان
بەتەنها ئاماژەیەک بەسە:



ژیان گورزێکی ئارامە
بۆسەر تاشەبەردی "مەگار"[١٣].

لە ڕەوتی سەفەرا مەلەکانی "باخی نەشات"
تەپوتۆزی ئەزموونیان لەنیگای من سڕییەوە.
ساغێتیی دارسەرروویەکیان پیشاندام.
منیش عیبادەتی هەستم
پیشانی پاسەوانیی ڕۆشنایی "حاڵ" دا،
لەکەناری "تاڵ"[١٤] دانیشتم و
بەگەرمی لەبەرخۆمەوە کەوتمە زەمزەمە.

ئەبێ گوزەر کەین و
ببینە هاوەڵی ئاسۆ دوورەکان و
ناوبەناویش
لەدەماری پیتێکدا دەوار هەڵبدەین.
ئەبێ گوزەر کەین و
ناوبەناویش
تووی سەرلقێک بخۆین.





من بەلای غەزەلدا دەڕۆییم و
وەرز وەرزی بەرەکەت بوو.
ژمارەکانی لمیش لەژێر پێما ئەتلیسانەوە.
ژنێ گوێی لێ بوو.
هاتە لای پەنجەرەکەوە، سەیری وەرزی کرد.
لەسەرەتای خۆیدا بوو.
دەستە سەرەتاییەکەشی، بەنەرمی
شەونمی دەقیقەکانی
لە جەستەی ئیحساسی مەرگ ئەچنییەوە.
من ڕاوەستام.
خۆری غەزەلیش بەرز بوو.
منیش چاودێری بەهەڵمبوونی خەونەکان بووم و
گورزەکانی گیایەکی سەیرم ئەژمارد
کە بەر جەستەی زەینم ئەکەوتن:
وامان ئەزانی
سنوورێکمان بۆ نییە.
وامان ئەزانی
لەنێو دەقە ئەفسانەییەکانی گرژیی ڕێواسدا



مەلە ئەکەین و
چەند چرکەیەک غەفڵەت، ئامادەگیی بوونی ئێمەیە.

لەسەرەتای خەتەرناکی گیاکاندا بووین
کە ژنەکە چاوی بە من کەوت:
- دەنگی پێی تۆ هات، وامزانی "با"یە و
بەسەر پەردە کۆنەکانا دەگوزەرێ.
هەر لەلای شتەکانەوە
گوێم لە دەنگی پێت بوو.
- کوا جەژنی خەتەکان؟
- بڕوانە مەوجدانەوە، هەڵکشانی جەستەم.
- لە کوێوە من ئەگەمە ئەو بانە بەرزە؟
- تا ڕووبەری تەڕی پەرداخ،
درێژبوونەوەم
پڕ لە بانی تینوێتی کە.
- لەکوێ ژیان هێندەی شکانی دەفرێک
ناسک ئەبێتەوە و
گەرمای زاری ئەسپ





نهێنیی پێگەیشتنی تۆڵەکە ئەتوێنێتەوە؟
- لەکەڵەکەبوونی جوانی دەستەکانا، ڕۆژێکیان
دەنگی ڕنینەوەی هێشوویەکمان هاتەگوێ.
-لەچ سەرزەمینێکیش بوو
کە لەسەر هیچ دانیشتین و
لەگەرمیی سێوێکدا ڕوخسارمان شت؟
- پریشکی مەحاڵ لە بوون ئەبۆوە.
- لەکوێ ترسی تەماشا تەنک ئەبێتەوە و
نادیارتر ئەبێ لەڕێی مەلێ بەرەو مەرگ؟
- لەگفتوگۆی جەستەکانا ڕێی سپیدار
چەند ڕووناک بووا!
- کام ڕێ من بەرەو باخی مەوداکان ئەبا؟

ئەبێ گوزەر کەین.
گڤەی بادێ، ئەبێ گوزەر کەین.
منیش موسافیرم، ئەی بایە هەمیشەییەکان!
بمبەن بۆ هەراویی سەرەتای دروستبوونی گەڵاکان.
بمگەیەننە مناڵیی سوێری ئاوەکان و



تا کامڵبوونی جەستەی تریّ
پێڵاوەکانم پڕ لە بزاوتی جوانیی خاکیبوون بکەن.
ساتەکانم تا کۆترە دووبارە بۆوەکان
لەئاسمانی سپیی غەریزەدا هەڵدەن.
ڕووداوی بوونی منیش لەنزیک درەختەکەوە،
بکەن بە پەیوەندییەکی ونبووی پاک و
لەهەناسەدانی تەنیاییدا،
پەنجەرەکانی شعورم بەیەکادەن.
بمنێرن بەدوا کۆلارەکەی ئەو ڕۆژەدا.
بمبەن بۆ خەڵوەتی مەوداکانی ژیان.
حزووری سازگاری "هیچ"م
پێ پیشان بدەن".

**بابول، بەهار ١٣٤٥ (١٩٦٦)**





**پەراوێزەکان:**

(١) **جاجرود:** ڕووبارێکە لەکێوەکانی شەمێرانەوە سەرچاوە دەگرێ و بەلای خۆرهەڵاتی تاراندا دەڕوات.

(٢) **بەردی ڕونوس:** ناوی بەردێکە، دەڵێن هەرکەسێ ئەنگوستیلەیەك کە لەو بەردە دروستکرابێ بیکاتە پەنجەی، تووشی خەم و ئازار نابێت.

(٣)**مەزامیر:** واتە (مەزموورەکان) ی داود پێغەمبەر کە لای جوولەکە و مەسیحییەکان بەشێکە لە کتێبی (پەیمانی کۆن) و لەگەڵ ئاوازی نەی دا گوتراونەتەوە .

(٤) **ئیرمیای پێغەمبەر:** لە ئۆرشەلیم وەعزی دائەدا و پێشبینیی ئەوەی کردبوو کە جوولەکەکان لە شەڕدا نشوستی دەهێنن و بە خەڵکی دەگوت کە ڕووبەڕووی بابلیەکان نەبنەوە. پاش کەوتنی ئۆرشەلیم، لەگەڵ دیلەکاندا دەچێت بۆ بابل. کتێبی لاوانەوەکانی ئیرمیای پێغەمبەر لە تەوراتدا بریتییە لە کۆمەڵێك شیعری لاوانەوە بۆ ئۆرشەلیم پاش کەوتنی.

(٥) **کتێبی جامیعە:** کتێب یان سیفری کەسێکە کە ناوی جامیعەی کوڕی داود بووە. سیفرێکە لە سیفرەکانی تەورات کە ژیان بە شتێکی هیچ دەزانێت و دەڵێت کە مرۆڤ چەند بەحیکمەتتر بێت زیاتر غەمبار دەبێت و مردن لە لەدایکبوون و خەمیش لە پێکەنین باشترە.



(٦) **لەوحی حامورابی:** ئەو لەوحەیە کە یاساکانی حامورابی لەسەر نووسرابۆوە و بە کۆنترین یاسای جیهان دادەنرێن.

(٧) **توور:** مەبەست کێوی توورە کە تیایدا حەزرەتی مووسا لەگەڵ خوادا ئەدوێت.

(٨) **تەکلیم:** ئاخاوتنەکەی نێوان مووسای پێغەمبەر ( د.خ) و خودا (موسی کلیم اللّه).

(٩) **ڤیداکان:** کۆنترین سروودی هندییە ئارییەکانن.

(١٠) **قادسیە:** مەبەست لەو شەڕە کۆنەیە کە لەزەمانی عومەری کوڕی خەتتاب و یەزدگەری سێیەمدا لەنێوان عەرەب (بەسەرکردایەتیی سەعدی کوڕی وەقاس) و ئێرانیەکان (بەسەرکردایەتیی ڕۆستەم فەڕوخزاد)دا قەوما و تیایدا ئێران شکستی هێنا.

(١٠)**جادەی ئەدویە:** یان جادەی بخوور، ناوی ڕێگایەکە کە لەوێوە داوودەرمانیان بۆ دوورگەی عەرەب ئەبرد و کەلوپەلی هندو چین و ئەفریقاش لەوێوە ئەگەیشتە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.

(١١) **هامون:** دەریاچەیەکە لەباکووری خۆرهەڵاتی سیستان، بەشێکیشی دەکەوێتە خاکی ئەفغانستانەوە.

(١٢)**جومنا:** ڕووبارێکە کە لە شاخی کلیندەوە (لە هیمالایا) سەرچاوە دەگرێ و لە ئەڵلائابادا دەڕژێتە ڕووباری پیرۆزی "گەنگ"ەوە، ئاوەکەی بەپێچەوانەوەی ئاوی "گەنگ"ەوە، ڕوون و زوڵاڵە.





(١٣) **مەگار:** ناوی شارێکە لەیۆنانی کۆندا هەبووە، بەپێی میتۆلۆژیای یۆنانی تاشەبەردێکی گەورەی لێ بووە، وەختێ بەردێکی بچووکیان پیاکێشاوە دەنگێکی خۆشی لێ هاتووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی گوایا جارێک لەجاران ئەپۆڵۆن ئامێرە مۆسیقاییەکەی خۆی لەسەر ئەو تاشەبەردە داناوە.

(١٤) **تال:** دەریاچەیەکە لە کەشمیر "نەشات باخ" بەسەر ئەم دەریاچەیەدا دەڕوانێ.

(سەرنج: بۆ ڕاڤەی ئەم پەراوێزانە سوودم لەم کتێبە بینیوە: از مصاحبت ئافتاب، کامیار عابدی- تهران ١٣٧٦)

**تێبینی:**

**هەردوو شیعری (دەنگی پێی ئاو) و (موسافیر) لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون:**

**عاشق هەمیشە تەنیایە، ژیان و شیعری سوهراب سپهری، وەرگێڕانی ئازاد بەرزنجی،( چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی:٢٠٠٦).**



## پێڕست







## بەرهەمەکانی نووسەر

١- خورپەی ناخ، نامیلکەی شیعری بەرباخەڵ ١٩٩١ سلێمانی.
٢- هۆرەی قەڵا ، بەرهەمی هاوبەش ١٩٩٢ . سلێمانی.
٣- چرپەی دڵ، نامیلکەی شیعری بەرباخەڵ ١٩٩٨ . سلێمانی.
٤- ئەفسانەی پایز، شیعر٢٠٠٠ . سلێمانی.
٥- -چرپەی ناخ، شیعر٢٠٠١ . سلێمانی.
٦- ژنێك دەمرێ و پیاوێك بەچراوە نایە، شیعر٢٠٠٥ سلێمانی.
٧- گەڕان بەدوای شیعرو جیاوازییدا، لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی ٢٠٠٦ سلێمانی.
٨- لالەزاری وشە، کۆمەڵێك رەخنەو بابەتی ئەدەبیی ٢٠٠٧. سلێمانی.
٩- لەئیرادەی مەرگەوە بۆ ئیرادەی ژیان و دنیای خەونە گەورەکان، لێکۆڵینەوە٢٠٠٨. سلێمانی.
١٠- ژەنەراڵی خۆشەویستی، شیعر ٢٠٠٨. سلێمانی.
١١- جوانی و جیاوازی، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ٢٠٠٩. سلێمانی.
١٢- بۆنی بەختەوەری، شیعر ٢٠١٠. سلێمانی.



## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی (٢٠١١)ی

## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دەروازەیەک بۆ تەکنەلۆژیای نانۆ | محەمەد ساڵح فەرەج دوکانی | زانستیی | ٧٧١ | |
| ٢ | سروود و گۆرانیی نیشتیمانیی و بەرەنگاریی کوردی لە کرمانجی خواروودا(١٩٣٥-١٩٩١) | عەبدولواحید ئیدریس شەریف | لێکۆڵینەوە | ٧٧٢ | |
| ٣ | سێبەری تلیاک | لوقمان سیوەیلی | لێکۆڵینەوە | ٧٧٣ | |
| ٤ | مانشێت لە ڕۆژنامەوانیی کوردی و کاریگەرییەکانی (حیزبی و ئەهلی) | محەمەد مێرگەسۆری | لێکۆڵینەوە | ٧٧٤ | |
| ٥ | درامایەک لە پارکێکدا | و. عەبدوڵڵا قادر (دانساز) | چیرۆک | ٧٩١ | |
| ٦ | پاراستنی دەم و ددان | د. هەڵگورد ساڵح | تەندروستیی | ٧٧٦ | |
| ٧ | وێنەیەکی دەگمەنی فرانز کافکا | و. ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل | چیرۆک | ٧٧٧ | |
| ٨ | باڵندەکانی شەو | ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی | چیرۆک | ٧٧٨ | |
| ٩ | منارەی ئاوەدانیی | کاروان کاکە سور | چیرۆک | ٧٧٩ | |
| ١٠ | هونەر و فیگەرە جوانەکانی خەون | ناڵە حەسەن | لێکۆڵینەوە | ٧٨٠ | |
| ١١ | بیبلۆگرافیای گۆڤاری هەنار | مارف ناسراو | بیبلۆگرافیا | ٧٨١ | |
| ١٢ | چەند نووسینێکی ئەکادیمی کۆمەڵناسیی لەسەر هەوییەی کورد | سیاوەش گۆدەرزی | لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسیی | ٧٨٢ | |
| ١٣ | مێژووی گریان | سەلاح حەسەن پاڵەوان | لێکۆڵینەوە | ٧٨٣ | |
| ١٤ | ڕوانین لە دەق | د. تاهیر محەمەد عەلی د.قومری سەعید عەزیز | لێکۆڵینەوە | ٧٨٤ | |
| ١٥ | عاشقێك گۆرانی دەڵێت | لەتیف فاتیح فەرەج | شیعر | ٧٨٥ | |
| ١٦ | دەروازەکە | و. عەلی حسێنی | شیعر | ٧٨٦ | |
| ١٧ | پەیکەرێك لە تۆزی دەباشیر | جەبار جەمال غەریب | ڕۆمان | ٧٨٧ | |
| ١٨ | شلۆمۆکوردە و من و ڕۆژگار | و. جەلیل کاکەوەیس | ڕۆمان | ٧٨٨ | |
| ١٩ | کێشەی زمانی ستانداردی کوردی | عەلی سدیق | دیدار | ٧٨٩ | |
| ٢٠ | گفتوگۆ | و. شۆڕش محەمەد | دیدار | ٧٩٠ | |
| ٢١ | کەرەستەی گەندەڵیی | ڕەسوڵ بۆسکێنی | لێکۆڵینەوە | ٧٧٥ | |
| ٢٢ | دمیان | و. عیسا چیایی | ڕۆمان | ٧٩١ | |
| ٢٣ | نزای بەرخەکان | و. ڕەفعەت مورادی | ڕۆمان | ٧٩٢ | |
| ٢٤ | هاوشێوەکانی سەلیم جەودەت | مەحمود نەجمەدین | کۆمەڵە چیرۆک | ٧٩٣ | |
| ٢٥ | پەراوێزی بیرکردنەوە | ڕەزا عەلی پوور | وتار | ٧٩٤ | |
| ٢٦ | ئابشوران | و. مەجید ساڵح | چیرۆک | ٧٩٥ | |
| ٢٧ | ڕموزنبوون | و. پێشەوا فەتاح | ڕۆمان | ٧٩٦ | |
| ٢٨ | "گونتەر گراس" پێنج باڵندەکەو چەند چیرۆکێکی دیکەی ئەڵمانی | و. دڵنیا عەبدوڵڵا | چیرۆک | ٧٩٧ | |

| ٢٩ | یەشار کەمال سەبارەت بەخۆی دەدوێت | و. بەکر شوانی | دیدار | ٧٩٨ | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٠ | گیلۆتین | و. سامان عەلی حامید | لێکۆڵینەوە | ٧٩٩ | |
| ٣١ | بازرگانییەکی کوشندە | و. محەمەد عەبدوڵلا | کۆمەڵە چیرۆک | ٨٠٠ | |
| ٣٢ | دوایین ئێوارە | کوێستان عومەر زادە | شیعر | ٨٠١ | |
| ٣٣ | بالانسی ژن لە نێو کاریزمای نووسیندا | شیرین تاهیر | وتار | ٨٠٢ | |
| ٣٤ | پرانسیپەکانی ئەدەبناسیی بەراورد | و. د. ئەنوەر قادر محەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨٠٣ | |
| ٣٥ | دەروازەیەک بۆ ڕێنمایی دەروونی و پەروەردەیی | نازەنین عوسمان محەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨٠٤ | |
| ٣٦ | هەڵەبجە زنجیرە لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە | عادل سدیق عەلی | لێکۆڵینەوە | ٨٠٥ | |
| ٣٧ | مەحوی لە نێوان حەزی دنیایی و عیشقی خودایدا | عەتا قەرەداخی | لێکۆڵینەوە | ٨٠٦ | |
| ٣٨ | مێژووی چاپخانە لە شاری کەرکوکو ڕۆڵی محەمەد ئەمین عەسری لە پێشکەوتنیدا | هەڵۆ کاکە وەیس | لێکۆڵینەوە | ٨٠٧ | |
| ٣٩ | سانسۆری ڕۆژنامەگەریی لە هەرێمی کوردستاندا | کارزان محەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨٠٨ | |
| ٤٠ | تێکستی ژنان لە دەفتەرەکانی یارساندا | نامق هەورامی | لێکۆڵینەوە | ٨٠٩ | |
| ٤١ | لەسەر شاباڵی دەریا دەنووسم | پەری شێخ ساڵح | شیعر | ٨١٠ | |
| ٤٢ | منیش چیٚ کیڤارام | و. دلاوەر قەرەداغی | چیرۆک | ٨١١ | |
| ٤٣ | یادگیری زبان کردی قدم بە قدم | عدنان عبدالرحمان سجادی | زمان | ٨١٢ | |
| ٤٤ | کۆمەڵێک پەند و ئیدیۆمی کوردی | زەکیە ڕەشید محەمەد. | کەلەپور | ٨١٣ | |
| ٤٥ | کەشکۆڵی زانست و تەکنیک | جەمال موحەممەد ئەمین | زانستیی | ٨١٤ | |
| ٤٦ | دەرکەوتەی دڵخوازی مەرگ | سەعید سلەیمانی | لێکۆڵینەوە | ٨١٥ | |
| ٤٧ | سیماو خەسڵەتی کارەکتەر لە کورتە چیرۆکی کوردی نێوان ١٩٢٥-١٩٥٠ دا | د. مەریوانی عومەر دەوڵەت | لێکۆڵینەوە | ٨١٦ | |
| ٤٨ | تێڕوانینێکی نویٚ بۆ سینۆنیم لە زمانی کوردیدا | شیروان حسەین حەمەد | لێکۆڵینەوە | ٨١٧ | |
| ٤٩ | مەم و زین | تەلعەت سامان | شانۆگەری | ٨١٨ | |
| ٥٠ | چوونە ناو سوریٚ مانا | تەلعەت تاهیر | کۆمەڵە وتار | ٨١٩ | |
| ٥١ | ئەستێرە گەشەکان.... سی و دوو خوێندنەوە بۆ سی و دوو فیلمی سینەمایی | سیروان رەحیم | خوێندنەوەی فیلم | ٨٢٠ | |
| ٥٢ | ئەفسانەی کوێربوون | نەجات نوری | چیرۆک | ٨٢١ | |
| ٥٣ | فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی | نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد | فەرهەنگ | ٨٢٢ | |
| ٥٤ | موقف ترکیا من القضیة الکردیة | تەلار عەلی ئەمین | لێکۆڵینەوە | ٨٢٣ | |
| ٥٥ | مێژووی تۆپی پێی هەڵبژاردەکانی جیهان | هەوراز کاوە | وەرزشی | ٨٢٤ | |
| ٥٦ | بنەماکانی بزافی نەتەوەیی و ڕەهەندی ڕۆشنبیری | ڕەئوف مەحمود پور | لێکۆڵینەوەی مێژوویی | ٨٢٥ | |
| ٥٧ | کوڕانی گەڕەك | و. غەفور ساڵح | ڕۆمان | ٨٢٦ | |
| ٥٨ | من بەلزاکم کوشت | و. مستەفا فاتح عومەر | کۆمەڵە دیدار | ٨٢٧ | |
| ٥٩ | ژنە جنۆکەکانی شێمەحموو | لەتیف هەڵمەت | ڕۆمان | ٨٢٨ | |
| ٦٠ | دنیای سوهراب | محەمەد کوردۆ | لیکۆڵینەوەی ئەدەبی | ٨٢٩ | |
| ٦١ | بنەماکانی ئیدارە | دیلمان محەمەد سابیر | ئیدارە | ٨٣٠ | |

| ٦٢ | سێدەرا شێشمس | کۆڤان خانکی | داستان | ٨٣١ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ (KHI) |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ٦٣ | شەڤێن چلەیی | عەبدولڕەحمان بامەڕنی | داستان | ٨٣٢ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ (KHI) |
| ٦٤ | ولاخی یەك سم | عەزیز مورادی | داستان | ٨٣٣ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ (KHI) |
| ٦٥ | داستانی قەندیل قەلا | هاشم کاکەیی | داستان | ٨٣٤ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ (KHI) |
| ٦٦ | فەرهەنگی شەبەك | هەردەوێڵ کاکەیی | فەرهەنگ | ٨٣٥ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ (KHI) |
| ٦٧ | مەولوودنامەی پێغەمبەر | هەردەوێڵ کاکەیی | مەولودنامە | ٨٣٦ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ (KHI) |
| ٦٨ | GOTINÊN PÊSIYAN | ÊZÎZ XEMCIVÎN | پەند و ئیدیۆم | ٨٣٧ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ (KHI) |